هةست بةم ثيَويستية دةكةن كة دةبيَ ضاكسازى ئةنجام بدريَ رذيَمى كؤمةلايةتيى ئيستا سةر نطون بكريَ طة بةبيَ ئةنجام دانيان خؤشى و ئارامى لة ولات نايةتة دى).
لة راستيد لة هةر لاثةرةيك لة لاثةرةكانى بيرةوةريةكانى طيظارا لةسةر شةرى شؤرشطيَرانةى كوبى ديد و بؤضونى ئةومان بةر ضاو دةكةويَت كةلةسةر شةرةكةى نوسيوةتةوة, زؤربةى بيرؤكةكانى كة لة نوسينة ئايدؤلؤذيةكانيدا هاتووة هيَشتا لة قؤناغى دروست بووندان طومانيش لةوةدا نية هزرة ئايدؤلؤذيايةكانى لة ميانةى خةباتى لة السيرا مايسترا لة دايك بوون كة ثوختةكةى بريتية لة شارةزا يى و بسثؤرى لة بوارى جةنطدا , وةكو ئةو باسةى لةسةر كاتى بؤسة نانةوةكة دة نوسيَ لة(هؤم بريتؤ) :
(دةلى لةم شةرةدا بؤمان دةركةوت كة لة ذيَر دؤخى تايبةتى و دياردا ئةم جؤرة هيَرش كردنانة ضةند ئاسانن ئةوكاتةى كة كاروانى دوذمن بةريَوة دةبريَن ) جاريَكى تر جةخت لةوة دةكاتةوة كة راستى ئةو دةست وةشانانة دةسةلميَنيَ دةلىَ : كاتيَك طورز لةسةر كيَشى هيَزةكانى دوذمن دةدةيت و هةولى كوشتنى يةكةم ثياو يان يةكةم كؤمةلةى دوذمن دةدةيت كة دةبيَتة مايةيى سةر ليَشيَوانى سةرجةم هيَزةكةى دوذمن و شكست بة هيَرشةكةى ديَنيَ , ثيادةكردنى ئةم جؤرة تةكتيكانة دوذمنى ناضار كرد ووردة ووردة دةست لة هيَرش بردن بؤ سةر السيرا مايسترا بةربدا و طةليَك جار سةربازةكانيان فةرمانى سةرةوةى خؤيان بةجيَ نةدةطةياند ، لة هيَرش بردن دةكةوتن و ريزةكانى ثيَشةوةى ئةوانيان جيَ دةهيَشت.
طيظارا لة ميانةى هةلسةنطاندنيكي يةكيَك لة شةرةكانيدا دةست نيشانى خالة لاوازةكانى دةكا كة بوونة هؤى سةرنكةوتنى هيَرشةكة.
طيظارا تةنها باسى لة رودانى شةرةكة نةدةكرد بةلكو هةولى دةدا لة شةرةكاندا ثةند وةرطريَ بؤ شةرةكانى تر , ئةوةى راستى بيَ هةردوو فاكتةرى(بؤسة نانةوة و هيَرشكردن) بونة بنةماى ضالاكى شةرى ثارتيزانى و ستراتيذيةتى شةرى راستةقينة لةشةرةكانى بؤليظيا.
فيدل كاستروَ ثةيوةندى باشى لةطةل ثارتة ئؤثزسيؤنةكانى كوبا ثةيدا كرد لة ثيَناو روخاندنى رذيَمى باتيستا داواى هاوكارى و ثشتيوانى ليَ كردن لة بةرامبةريشدا ثةيمان و طفتى ثؤست و ثلةى ثيدان .
ئوميَدى مةزنى بةو مانطرتنة سةرتاسةرية هةبوو كة لة شارةكان لة نيسانى 1958 ئةنجام دران.
بةلام سةرنةكةوتنى سةلماندى كة مةزنترين كارةسات بوو بؤ ئةوان , بوة مايةى روخانى ورةى دوذمنانى باتيستا و ثضرانى هيَلى يارمةتى و هاتوضؤى نيَوان شارةكان و دةست ثيَكردنى هيَرشيَكى بةربلاو بؤ سةر شارةكان و السيرا مايسترا , ئةم هيَرشة لة هاويندا زيان و شكستى بؤ شؤرش هيَنا. دةتوانين بليَين ئةم شكستة طوامانيَكى خستة دلى طيظارا لة هاوكاريةكانى دانيشتوانى سظيلى شارةكان كة بة ثارتيزانةكانى شةرى كوبا دةدا.

بۆیة زۆر بڕوای بە هێزی مەدەنی نەبوو کە بە دیدی ئەو (نەرم کێش و نا واقعی بوون).
بەلام (هیرَشە دریَذەکەی) کرایە سەر دورطە کە لە دوای شەرەکانی کاسترۆ ئەنجام درا لە سالی 1958 بە هۆیەوە دوورطە بوو بە دوو لەت و بایەخ و بەهای کاری سظیلی زیاتر هاتە بەرضاو.
ضـونکة ئـەم هێرشـة هةنـدیَك لـة شـارةکانی نـاو ضـیاکانیان رزطـار کـردو ریَطـای هاتووضۆکۆدنی لـة نیَـوان شـارةکانی تـر دا بـری بـەم شیَوةیة الیسترا مایسترا دابـرا و دواتر بة یةکجارةکی دةستی بەسەدا طیرا.
(چی ) ئەو ئەزموونەی تشتی ثیَ دةبەست بریتی بو لة دامەزراندنی بنکةی سەربازی لـة طونـدةکان و دواتـر فـراوان کردنیـان تـا ئـەو کاتـەی طوندةکـة دةکةویَتـة دةسـتیان و شارةکة دادةبریَت و ئیتر ئەویش دةکةویَتة دةست. بة دیدی طیظارا ئـەرکی طونـدة شـار رزطار بکا ، ضونکة دةبیَ لة دةرةوةی شار هیَرش بکریَتة سەر سەنتەری شـار نـةك لـة ناوةوة.
هیَرشـةکةی (الیسـترا مایسـترا) و هةلویَ ستی ثاریَزطـاری ثـارتی کۆمۆنیسـتی کـوبی سةبارةت بەو شۆرشەی ثرۆلیتاریایی شار سەرثەرشتی دةکـات لـة ریَطـەی زنجیرةیـةك لة مانطرتن و تیَك و ثیَکدانی ئامیَری بەرهـەم هیَنـان و دواتـر بـة شـۆرش کۆتـایی بـیَ. بووة هۆی ئەوةی طیظارا دذایةتی مارکسیزم-لینینیزم بکات .
بەدیدی طیظـارا جوتیـارة ضـةکدارةکان بەسـەر طوندةکانـدا زال دةبـن تـا ئـەو کاتـەی شارةکان وةکو مۆزی طەنیو یةك لة دوای یةك دةکەونـة خـوار, ئەمـة بـوو ئەزموونەکـەی طیظارا کة بۆلیظیایی بەرةو دابرانیَکی جوطرافی برد.
ئەطـەر بمانـەویَ لة هةلة سەرةتایةکان و سـەرکەوتنەکانی وةکو کەسیَکی ثـارتیزان لـة السیرا مایسترا ئاطاداربین، کاتیَکی دریَذی دةویَ ضونکة ئەو 25 مانطـەی لـەویَـی بـردة سـەر کردیـة ثیـاویَکی ریَکخـەر و بیرمەنـد و بسـثۆر لـة تەکتیکدا واتـة بـوو بـة نیمضـة ثالةوان , لة کاتیکا جطة لة طەنجیَکی نەخۆشی تەنطة نەفەس هیضی تری نەبوو.
کەسیَکی ئةفسوناوی خـاوةن رۆشـنبیریةکی شارسـتان بـوة , بـة هـۆی طـەران لـة نیَـو هـةذارةکانی ئـەمریکای لاتـین خویَندنـەوةی مارکسـیزم و لینینیـزم خـۆی بـة کەسـیَکی شۆرشطیَر دةزانی.
بـة هـیض شیَوةیةك لـة شـیَوةکان جیـاوازی نـەبوو لەطـەل هـەزارةها ثیَشـکەوتوةکانی ضـینی مـام ناوةنـدی لـة رووی ثیشـەی ئـازادةوة , بـەلام کاتیَـك لـة جیَنیـوەری 1959 دةسـەلات لـة باتیسـتا دةسـیَندریَتەوة و حکومـەتی طواسـتنەوة لەسـەر دةسـتی کاسـترۆ دادةمـەزریَ ، طیظــارا دةســەلمیَنیَ کــة جــەنطاوةریَکی طەریلایــة و خــاوةن هیَــز و ئازایةتیـةکی مەزنـة بۆیـة لـة ثیـاوة مەزنـەکانی کوبـا ، ئەوةنـدةی نـەبرد تـا بەمـەزنترین کەسایەتیی شۆرش دیَتة ئەذمار.

ئەركی سەرەكیي بریتي بوو لە نوسین و دارشتنی ئایدۆلۆذیا (بە شیَوەیەكی ریَك و ثیَك و طونجاو) كە ثیَك هاتبوو لە كۆمەلیَك بیردۆزی ناكۆك ئەوانەی لە ئەنجامی سەركەوتنەكانی كاسترۆ هاتبونە كا.
شۆرشی كوبا كاری كردبووە سەر باری سیاسی و ئایدۆلۆذیی طیظارا ، ثەیوەندیەكانی لەطەل شۆرشدا طۆری بۆ(بانط خوازی ضاكسازی كشتوكالی) لە سەر بنە مایەكی شۆرشطیَرانە ی دەكرد .
ئەمانە بوونە مایەی ئەوە لە قۆناغەكانی داهاتوو بە كۆ ململانیَ لەطەل باتیستای زۆردار بكەن تا طەیشتە ئەو ئاستەی بیر لە دەستەوادەی (شەری طەل) بكا , جەختی لە رۆلی ویلایەتە یەكطرتووەكانی ئەمریكا كردەوە لە هاوكاری كردنی رذیَمی باتیستا بە دریَذایی رۆذەكانی شەری نەطریسی (ئیمثریالیزمی ئەلیانكی).
رەوشتی سیاسەتمەدارە هەلثەرستەكانی باتیستا ئەوانەی بۆ بەرذەوەندی تایبەتی خۆیان بە كاسترۆ بەستبۆوە و طیظارایان بیَزار كردبوو كە هەندیَكیان لە ریَطای دیموكراسیەتەوە توانرابوو بخزیَنە ناویان و بەرز بكریَنەوە.
سەرەرای ئەمە(ضی)توانیبووی ئەو شارەزایە وەدەست بیَنیَ كە لە ریَطەی دەستەیەكی بضووكی جەنطاوەرانەوە شەری رزطاری هەلطیرسیَنیَ و دواتر ثەرە بسیَنیَ بطاتە قەوارەی تیثیَك لە سوثا و ببنە كۆمەلێک لە بیروراى طونجا وي نا ماركسیست لە كۆمەلەی ثارتیزانەكان و هەلطری ئالاي شۆرش .
بە دیدی طیظارا مەرجی سەركەوتن لای فەرماندەی بروا ثیَكراوە كە لای ئەو لە ریَكخستنی حیزب بە ئۆرطان و كادیرەكانەوە طرنطترە دواتر وەدەستهیَنانی بنكەی جەماوەری بۆ كۆمەلەیەكی بضووك سەركەوتنە ، طیظارا بە ثیَی شارەزایی و بسثۆری خۆی لە سەر ثارتیزانەكانی كوبا ضەند مەرج و بنەمایەكی ثیادەكرد ئەم بنەمایانە بنەمای بنەرەتی بوون زۆربەیان بۆ شۆرشی جیهانی ستراتیذی سەربازی بوون.
سیَ بیرۆكە لە ثەرتوكەكەیدا كە بەناوی (بیرەوەریەكانی شەری شۆرشطیَری كوبی) زۆر دووبارە دەبوونەوە ، ئەمانیش بیرۆكەی نەریَنی بوون بۆ دیدەنی ئاسۆی داهاتوو:
1. ململانیَی فیكری باشترین ریَطەیە بۆ فیَربوونی جەنط و دروست كردنی ثیاوشۆرشطیَر. بیردۆز هەر ضۆنیَكی بیَت ناتوانیَت جەنطاوەری ثایەبەرز دروست بكات , كەوتنە ناو ئەزموونی ثراكتیكیی شەری شۆرشطیَرانە تاقە ریَطەیە بۆ دروستكردنی ثیاوی ثارتیزانی راستەقینە، هەر ئەویشە لە كەسانی ثیلانطیَر و خەون بین جیا دەكاتەوە.
2. ململانیَی راستەقینە ضۆن جەنطاوەر دروست دەكات ئەواهاش دیمەن دروست دەكات . دەكریَت ثیاو بضیَتە ریز دەستەیەكی شۆرشطیَر كە هیض لە ئایدۆلۆذیا نەزانیَت بەلام لە كۆتایی هەر دەبیَت شتیَك لە ئایدۆلۆذیا فیَر ببیَ كەوایە دەبیَ هەولی طەشە ثیَدانی هزر و بیرەكانی كۆمەلایەتی بدا هەروەكو طەشە بە توانا سەربازیەكەی دەدا. ضونكە توانا سەربازیەكەی ناتوانیَ یارمەتی بدا بۆ دریَذە

دان بة شةرى ثارتيزانى , بةم شيَوةية دةطةينة ئةو ئةنجامةى كة بليَين باشترين جةنطاوةر ئةوةية كة شارةزايى لة كار و بارى سياسى هةبىَ و هةر ئةويش لة هةر كةسيَك ثاليَوراو ترة بؤ ئةوةى دواى سةركةوتن ببيَتة فةرماندة, ضونكة ئةو لة كةسيَكى تر كة نة جةنطا بيَت واقيع بينترة.

3. ثارتيزانةكان هةنديَك تايبةتمةنديان هةن كة بة تايبةتمةندى ناوةكى ديَنة ئةذمار. هام شؤ و مامةلةكردنى طيظارا لة السيرا مايسترا لةطةل كؤمةليَك لة ثياوى ئازا و نمونةيى فيَرى طةليَك دةستةواذةى ثالةوانى ثياوى فيداكار بوو. لاثةرةكانى ثةرتوكى (بيرةوةريةكان) ثريةتى لة دةربرينى تةمةنا و سوثاس طوزارى بؤ ئةو ثياوانةى لة شةرةكاندا طيانيان سثاردوة. طيظارا هاوكار بوو بؤ خولقاندى ئةفسانةى ثالةوانى ثارتيزانةكان . ويَراى ئةوةى كة ئةمة بة ثيَضةوانة بيركردنةوةى لةسةر يةكسانى هاتن ئةو كاتةى بة طيان ئامادة دةبوو ئةفسانةيةكى تايبةتيى ئامادة دةكرد.

---

بةشى سىَ يةم

## بيردؤزةكانى شةرى ثارتيزان

بةلكو ثسثؤرة سةربازيةكان وةكو (كاثتن ليدل) لةسةر ثيَشينةى سياسى رازى نةبن كة بوونة هاندةرى طيظارا , بةلام لةسةر ئةمة كؤكن كة بيردؤزةكانى شةرى ثارتيزان ديراسةى ستراتيذى شةرى درةوشاوةن.

نووسينةكانى طيظارا لةسةر ئةم بابةتة شؤرشطيَرانة بوون , نووسينةكان نةخشة و ثلانيان بؤ سةركةوتنى راثةرينيَك دادةرشت كة كؤمةليَك خةلك دذى سوثايةكي نوىَ ى خاوةن تةكنةلؤذيا هةلسن.

بوونى دةرامةتيَكى كةم و ثالثشتيةكى طةل و هاتو ضؤيةكى ئاسايى ريَطة لة دةستثيَكردني راثةرينيَك ناطرىَ كة لة توانايدا بىَ سوثايةكى نيزامى سةر نطوم بكا لةبةر ئةوةى رؤذانة فةوجى نوىَ ديَنة ريزى .

بؤمبى ناوةكى سووديَكى كةمى دةبىَ لة قةلاضؤكردنى ثارتيزانةكان لة نيَو دارستانةكاندا هةروةها تانكةكانيان ناتوانن لة نيَو ضياكان بة ئةركى سةربازى خؤيان هةلسن.

سةركةوتنى شؤرشى كوبا هاندةرة بؤ هةلطيرسانى شؤرش لة شويَنيَكى تر , كاريطةرى شؤرشى طوبا كاريطةريةكى جيهانى بوو, لة ظيَتنامةوة تا كؤنطؤ لة شيكاطؤوة تا بةرازيل بيردؤزةكانى طيظارا كارى كردبووة سةر طةل , طةليَك سوثاى نوىَ و هاوضةرخى خاوةن ضةك و تةقةمةنى نوىَ تيَك شكيَندران .

ئەوەتا بە هۆی بوونی ناكۆكی لە هۆكارەكانی سیاسی و كۆمەلایەتی و ستراتیذی و سەربازیەوە ثارتیزانەكان لە جەزائیر و ظێَتنام سەركەوتنیان بە دەست هێنا و لە طواتیمالا و كۆلۆمبیا و ظەنزویلا و فلیثینیش تیَكەوتن , لەطەل ئەمەشدا هیض شەریَك لە و شەرانە لەوەی تریان نەدەضوو بە بیَ كاریطەری طیظارا .

طیظارا ثەرتوكی (شەری ثارتیزان) بابەتی سالی 1960 بە ووتەیەكی مەزنان دەست ثیَدەكات دەلیَت:ـ

شۆرشی كوبی ئەوەی سەلماند كە طەل لە توانایدایە بە ریَطەی شەری ثارتیزان خۆی لە دەست حكومەتە ستەمكارەكان رزطار بكات, دریَذە بە ووتەكانی دەدا و دەلیَ:

1. هیَزەكانی طەلەری دەتوانن شەر دذی سوثا بكە ن و سەركەوتن بە دەست بیَنن

2. زەرور نیە هەموو كاتیَك ضاوەروانی خولقانی حالەتیَكی شۆرشطیَرانە بین , دەكریَت ئەم حالەتە بە كاكلیَكی شۆرشطیَرانە بخولقیَندریَ .

3. ناوضە طوند نشینە دوا كەوتوەكانی هەردوو ئەمریكا بە باشترین طۆرەثانی شەری رزطاری دیَنە ئەذمار.

ئەم بروایانە بوونە مایەی هەلیَنجانی ئەو راستیانەی كە سیاسەتەكانی ثارتە كۆمۆنیستە فەرمیەكانی ئەمریكای لاتین رەت بكەنەوە.

كاتیَك لە توانای هیَزە طەلەریەكاندا بیَت دذی سوثا سەركەوتن وەدەست بیَنیَ كەواتە هیض ثاساویَك بۆ هەولوپستی سیاسیە قولابیەكان نیە كە وەكو تەماشەوان سەیری رووداوەكان دەكەن و دەلیَن هیَزی دەرەكی ناتوانیَ شكست بە سوثا بیَنیَ.

كەواتە و مادامەكی لە توانادا بیَ حالەتیَكی شۆرشطیَرانە بخولقیَندریَ ثیَویست بە ضاوەروانی ناكات تا ئەو كاتەی هەموو بارودۆخەكانی شۆرشی ماركسي بە خۆرسك دەخولقیَن.

دواتر كە ثارتیزانەكان لە توانایاندا بیَ لە طوندەكان سەركەوتن بەدەست بیَنن ض ثیَویست دەكات ضاوەروانی ئەوە بین شار نشین كۆمەلەی ثیشەسازوانەكان دەست بەسەر شاردا بطرن؟ لە كاتیَكا ئەمان نیَضیری هیَرش كردنە سەرن لەلایەن سوثاوە.

لەطەل ئەوەشدا طیظارا نكۆلی لەوە ناكات كە هیَزی كۆمەلەی طوندەكان هیَزی بضووكن و لە توانایاندا نیە هەموو كاریَك ئەنجام بدەن جطە لەو كارانەی بە یەك مەرج نەبیَ , ضونكە ئەوان وەكو ثیَشرەوی ضەكداری جەماوەر كار دەكەن بۆیە ناتوانن بە بیَ ثشتیوانی جەماوەر هەنطاو بنیَن كە ئەمەش مەرجیَكی بیَ سیَ و دووە.

كاتیَك هیَزی ثارتیزانەكان ثشتطیری جەماوەریان دەبیَ و دۆخی ئەوان لە رووی ذمارەوە لە دۆخی سوثا ناكا تەنها لە رووی ضەكەوە نەبیَ نابەرانبەرن.

دەكریَ كۆمەلیَك شۆرشطیَر هاوكاری طەل بۆ ماوەیەكی دیاری كراو وەدەست بیَنن, بەلام سوثا تەنها یارمەتی و هاوكاری بەردەوەندی بیرۆكرات و ئەوەانەی دەست بەسەر بەرذەوەندیەكانی طەل دا دەطرن وەدەست دیَنن .

ئەوانیش بە دەوری خۆیان دیارە كە ئەم هاوكاریيە لە لایەنە بیَطانە كانەوە ثیَ دەطا , بەم شیَوەیە ئەطەر طەل و دانیشتوانە خۆ جیَ ییەكان ثشتطیری هیَزە

شۆرشـطيَرةكانيان كـرد ئـةوا بـة دلنياييـةوة ثارتيزانـةكان سـةردةكةون, كـةوا بـىَ جةنطاوةرانى شةرى ثارتيزانى لة ثباوانى ثارتيزانى زياترة .

ئةوان ضاكسازى كؤمةلايةتين , ضةك لـة ثيَنـاو طـةل هةلدةطرن , لـة ثيَنـاو طـؤرينى حكومـةت دةجـةنطن , بـةم شـيَوةية راسـتيةكى راسـتةقينةى ناوضـةى ئؤثراسـيؤنةكان دةزانـن بـة شـيَوةيةك بتـوانن لـىَ ى بكشـيَنةوة و بـة ئاسـانى خؤيـان حةشـار بدةن.كـة رووبةروى هيض كار و هةلويَستيَك نةبن ئةطةر بـة مسؤطةرى نـةزانن سـةردةكةون .

ئةوان دةتوانن سوود لة خالة لاوازةكانى دوذمن وةرطرن و ثابةنـدى ستراتيذيةتى شـةر دةبن كة بريتى ية لة شيَوازى (بوةشيَنة و راكة).

هـةر لـة خؤشيةوة شـةرى فيداكارى قؤنـاغيَكى سـةرةتاى شـةرى كلاسيكية , بـة تـةنيا نـاتوانىَ شـةرةكة بباتـةوة بـةلام مةشـق كردنـة طةشـة بـة توانـاى شؤرشـطيَرةكان دةدا و دةيان كا بة سوثايةكى بضووك كة بتوانىَ بةرةنطارى سوثايةكى نيزامى درِندة ببيَتةوة.

هـةروةها هـةموو خؤبـةخت كاريَك مـةزنى خؤيـةتى بـة هـةمان ئاسـتى كـة جةنـةراليَك ثاسةوانى خؤى دةكا و خؤى لة كوشتن دةثاريَزىَ بة هةمان ئاست و شيَوة فيداكارةكـةش لة سةريةتى ثاسةوانى لة خؤى بكا و خؤى لة كوشتن بثاريَزىَ.

ئـا ليَـرة (ضـى) بـةراوورد لـة نيَـوان سـةربازيَكى ئاسـايى و جـةنطاوةريَك لـة شـةرى ثارتيزان دةكا:

((هةموو فيداكاريَك دةبىَ بؤ مردن ئامادة بىَ. نةك بؤ بةرطرى كردن لة برواكان بـةلكو بؤ طؤرينى بروا بؤ راستى))

بة هؤى ئةوةى ئامانجى سوثاى نيزامى لةناو بردنـى هـةموو شـةرةكانى ثارتيزانـة , دةبـىَ ئامـانجى ثارتيزانـةكانيش ئاشـكرا كردنـى سـتراتيذيةتى سـوثاو لـةناوبردنى بـىَ. شكست بـة سوثا هيَنـان دةبـىَ بؤ ماوةيـةكى دريَذ خايـةن ئامـانجى ثيـاوانى ثـارتيزان بـىَ ضـونكة ئـةو كاتـةى تيَكيـان دةشـكيَنن دةسـت بةسـةر ضـةك و تفاقةكانيانـدا دةطـرن و شةريان ثىَ لةطةلدا دةكةن , دواتر بة ئاسانى دةتوانن دةست بةسـةر عـةمبارى زةخيـرة و تةقةمةنية كانياندا بطرن.

دةبىَ نةخشةى هيَرشةكانى ثارتيزان بة شيَوةيةك دابريَذريَن كـة بـة سـىَ قؤنـاغ جـىَ بـة جىَ بكريَن:

1. خؤ راطرى و طونجان لةطةل بارو دؤخى ذيانى شةرى ثارتيزانى دا.
2. ثـةرت كردنـى هيَزةكـانى دوذمـن لـةو شـويَنانةى كـة ثياوةكـانى ثـارتيزان بـة ناوضةى رزطاركراوى خؤيان دةزانن .
3. هيَرش كردنـة سـةر هيَزةكانى دوذمـن لـة بنكـة و ناوضـةكانى خؤيانـدا و جـةخت كردن لةسةر ليَدانى هيَلى هاتوو ضؤ و بنكةكانيان .

فةرمانـةكانى (ضـى) تونـد بـوون. ئازايانـة دةسـت لـة دوذمـن بوةشـيَنة , واى لـىَ بكـة هةسـت بكـا هـةردةم لـة ذيَـر دلـؤڤـانى ئةوانـة و طـةمارؤ دراوة. ئامـانجى فيداكارى بـة دانيشتوانى طوندةكان رابطةيةنة بة شيَوةيةك بؤيان شى بكةرةوة لة بةرذةوةنـدى خؤيـان لة راثرين دابيبنن.

شيَوازى تيَكدان و كاول كردنى مؤلطةكانيان ثيادة بكةن ، هةولى ثضرانى ثةيوةندى هات و ضؤكانيان بدةن , خؤت لة كارة تيرؤرستية بىَ سوودةكان دوور بخةرةوة , هةولى هيَشتنةوةى ثانتايى يةكى زؤرى زةويةكان مةدة.
كؤمةلَةى ثارتيزانةكان بة بةردةوامى نوىَ كاريان بؤ بكة , ضونكة ئةو كؤمةلَة نوىَ يانة دةتوانن خاكى زياتر بخةنةذيَر دةسةلاتيان كة لة توانايادا بىَ هيَرش بكةن سةر دوذمن.
بةهةرحال هةر دةبىَ تةكتيكةكانى قؤناغى لةطةلَ بارودؤخى طشتى بيَنةوة بة شيَوةيةك دةبىَ ثارتيزانةكان سوود لة هةموو رووداوةكان وةرطرن و لة بةردةوةندى خؤيان بةكاريان بيَنن.
شةرى كلاسيكى تةنها دوذمن دةيكا بةلام ثارتيزانةكان نابىَ كةس بة شويَن و كاتى جولانةوة و هيَرشةكانيان بزانن ضونكة هيَرشى كت و ثر و دةست و برد ، دةبىَ دروشمى ثارتيزانةكان بىَ.
((ئةو شتانةى كة هةرطيز ثارتيزانةكان نابىَ دةست بةردارى بن , كت و ثر و سةر لة دوذمن شيَواندن , هيَرشى شةوانةية)).
ثارتيزانةكان لة هيَرشةكانياندا دةبىَ ضوست و ئازا بن بة تايبةتى لةطةلَ ثياو كوذ و تاوانبارادا. بةلام لةطةلَ سةربازانى دوذمن ميهرةبان بن و زيندانيةكانيان ئازاد بكةن لةطةلَ ديل و بريندارةكان نةرم ونيان رةفتار بكةن هةروةها لةطةلَ دانيشتوانة خؤجىَ ييةكان بةريَزةوة مامةلَةيان لةطةلَدا بكةن و ريَز لة بةهاى داب و نةريتةكانيان بطرن , ئا بةم شيَوة رةفتارة دةتوانن رةوشتى بةرزى خؤيان نيشانى خةلَك بدةن و سةر لة دوذمن بسينن.
طيظارا لة ثةرتوكى (شةرى ثارتيزانان) نووسيويةتى دةبىَ و هةموو جؤرة ستراتيذيةكانى جةنط لةسةر خاكى دؤست و دوذمن لةو ناوضانةى شةرى تيايد لة بةرذةوةندى ثارتيزانةكانة و لةو شويَنانةى كة لة بةرذةوةندى ئةواند نية هةموويان شى دةكاتةوة , جطة لةمة جةنط لة شارةكان و باسى جؤرةكانى ضةك دةكا كة لة هةر ناوضةيةك ض جؤرة ضةكيَك دةكرىَ بةكارى بيَنى و ذمارةى جةنطاوةرة بةشدار بوةكة و تةكتيكةكان لةسةر بنةما و رةضاوى جوطرافياى ناوضةكان باسى ليَوة دةكا.
بؤ نموونة ئةو ناوضانةى كة بؤ شةرى ثارتيزان دةطونجيَن ئةو ناوضانة كةلكى كارى تيَك دان و وةدةست هيَنانى ثاتار و ضةكى دةست بةسةرداطيراوى دوذمن ديَت , بةلام ئةو ناوضانةى بؤ هيَرشى ثارتيزانةكان ناطونجىَ دةبىَ كةسانيَك لة هيَرشةكان بةشدارى بكةن كة تواناى جولةى خيَرا و تواناى مةزنيان هةبىَ. لة هةموو حالةتيَك دةبىَ ئاراستةكردنى شةرةكان لة دةرةوةى شارةكانةوة بىَ. لة بةشيَكى ثةرتوكةكةيدا (ضى) جةخت لةوة دةكاتةوة كة لة هةموو ئؤثةراسيؤنةكانى فيداكارى دةبىَ طوندةكان بنكةى هةميشةيى بن, شؤرشى شارةكانيش ئةو كاتة دةبىَ كة طوندةكان ثيَويستيان بة يارمةتى و ثشتطيرى دةبىَ.

بەشی دووەمی ئەرتوکەکەی طیظارا ئەرة بە بیرؤکەی ضؤنایەتی ئارتیزانەکان و كؤمەلەكەيان دەدات , رؤلی ئياوانی ئارتيزان وەكو ضاكسازی كشتوكالی وەكو جەنطاوەريَك لە ئيَناو ئازادی طەل , ئيَويستی بە زياتر روون كردنەوة و ئاشكراكردنی رؤلی هەية بەم ئيَوەرة هەموو جەنطاوەريَكی شؤرشطيَر دەبیَ خاوەنی دەست و دەم و داويَن ئاك بیَ هەلطری رةوشتيَكی بەرز بیَ لە هەلس وكەوتەكانيدا خؤی لە هەلەكان دور بخاتەوة.

(دەبیَ كەسيَكی ذير و سەر بەرز بیَ , نابیَ ئشت لە يارمەتی دانی جوتيارەكان بكا لە رووی هونەری و كؤمەلايەتی و ئابوری و شارستانيەوة ).

ئەم رةوشتانة دەبنە كارئاسانی بؤ ئەو شؤرشطيَرةكان دوای ئازادبوون و رزطار بوونيان بتوانن دريَذة بە رؤلی ضاكسازی شەری ئارتيزان بدەن, بەم شيَوةية ئەم ريطەی شؤرشطيَر كرتوتية بەر لەسەر دادئەروەری و يەكسانی راديَت لە داهاتوو دەتوانیَ ئەوكات بە دادئەروەرانە سزای خؤفرؤش و تاوانباران بدا و دەست بەسەر زةوية زيادةكانی دەرةبەط وداطيركەراندا بطریَ و دواتر بەسەر جوتيار و هەذارةكاندا دابەشی بكا ويَرای دەست طرتن بەسەر مولك و مالی دوذمنانی شؤرش و بەرذەوةنديەكانی.

هەروةها دەبیَ هەولی دروست كردن و ئيَك هيَنانی هەرةوةزی بؤ جوتيارةكان بدا بؤ ئەوةی خەلكی ناوضەكة بروای تەواويان ئیَ ی هەبیَ , بەم شيَوةية كار و كاردانەوة لە نيَوان شؤرش و جوتيارةكاندا ئەيدا دەبیَ , ديارة كە كەسی ئارتيزان ئاشخانيَكی ضينايەتی و مام ناوةنجيی هەية و خاوەنی ئاستی رؤشنبيری و وشياری يەكی باشی دەبیَ بؤ ووشيار كردنەوەی جوتيار و وەرزيَرةكان ، ئەم توانايە دەخاتە طەر ضونكة ئەوان تا ئەو ئاستة لیَ ی دلنيا دەبن كە باری ذيانی خؤيان بؤ باس دەكەن و كيَشە و طرفتەكانيان دەخەنە بەر دەست ، ديارة كە ئارتيزانەكانيش شارةزايی و زانياريی ئيَشوةختيان لەسەر باری ذيانی ئەوان دەبیَ و لە هەمان كات ئەوانيش (ئارتيزانەكان) دەكریَ وانەی باشيان لیَ فيَربن و كارة زةروريەكان بؤ ضارةسەری لە جوتيارةكان فيَر بن.

طيظارا بە باس كردن و شی كردنەوەی لايەنەكانی رةوشت و ئەقليەت و جەستەی ئارتيزان دريَذة بە نووسينەكای خؤی دەدا و دەلیَ:

ئەم تايبەت مەنديَتيەی ئارتيزان تيكەلاوييەكة لە شتی سەير و سەمەرة و جواميَری و برِواداری كە دەبیَ ئياوی شؤرشطيَر هەرطيز ئازاو ماندو نەناس بیَ , كەسيَك بیَ ئاسؤی داهاتووی لا طەش و روونك بیَ كەسيَك بیَ توند و خاوەن بريار بیَ لاواز نەبیَ بەرامبەر بە ئاستەنطەكان لە مامەلە كردن لەطەل ديل و نەخؤشدا دل ميهرەبان بیَ خؤراطر بیَ بەرانبەر بە ماندوو بوون و برسيتی و نەخؤشيدا .

دوای دياری كردنی ئەو هەموو تايبەت مەنديانەی شؤرشطيَران دەبیَ هەلطری ئامانجيَكی رون و ئاشكرا بیَ كە هەميشة بەريَوةی ببا ئەو ئامانجەش:

( دةبێ سادة و ساكار بێ ئامانجێك بێ دوربێ لة خةيال و واقعی بێ. ئامانجێك بێ شايةنی ئة وة بێ مرؤظ خؤی بؤ بةخت بكات, طرنط نية ئةو ئامانجة بة ئاستێكی زؤر مةزن بێ بةلام طرنط ئةوةية لای خةلكانی دةوروبةرت ثر بايةخ و بةها بێ, بؤ نموونة بةلكو وةدةست هێنانی ثارضةيةك زةوی كشتوكالی بێ بؤ جوتيارةكان كة لای ئةوان ئةمة لة هةموو شتێك طرنط ترة. يا بةرزكردنةوةی رؤذانة كة بؤ كرێكارةكان بة هةمان ئاست ثر بايةخ و طرنطة . دواتر طيظارا ئاماذة بةوة دةكات تا ئةوةندةی ئامانجةكة روون و ديار بێ ئةوةندة ورة و خؤراطری ثارتيزانةكة ثؤلاين تر دةبێ .
پزیشکێکی شۆڕشگێڕ لای گیڤارا گەڵێک دەگەیەنێ بە تایبەت لە روی دەرونیەوە کاتێک لە رۆژانی سەختی سەرەتایی شۆڕشدا پزیشکێک لە تەک شۆڕشگێڕێکی بریندار دەوەستێ ، بۆ ئەوان ورە بەرزی وبروا بە خۆ و بە شۆڕش بونە ، چونکە دەرمانێک یا تابلێتێکی ئەسپرین کە هەڤاڵێک یا شۆڕشگێڕێک پێی دەدا و لە ئێش وئازاری دەگا بۆ ئەو گەڵێک لە پشودانێک خۆشترە و ئارامیی بە گیاندا دێنێ . گیڤارا درێژە بە نوسینەکانی دەدا وزۆر بە هونەرمەندانە باس لە دامەزراندنی نەخۆشخانەی سەرەتایی دەکا هەر لە دارەبازەوە تا دەگاتە ئۆپەراسیۆن لە مەیدانی شەڕ و بنکە دواییەکان بۆ چارەسەری نەخۆش وبریندارەکانی شەڕ .
دواتر دێتە سەر پرسی پرۆپاگەندە وبە راپۆرتی هەواڵنێرانی دەناسێنێ ، لەسەر رۆژنامەو رادیۆی شۆڕشگێڕانە ئەگەر گرانیشیان لەسەر بوەستێ بەڵام دەبێ راستی بڵێن . دەبێ ئامانجی شۆڕشگێران لە راگەیاندن و پرۆپاگەندەدا ئاشکرا کردن وبڵاوکردنەوەی راستیەکان بێ چونکە گومان لەوە دا نیە پرۆپاگەندەو راگەیاندنەکانی حکومەت راستیەکان بەدرۆ دەخەن و هەوڵ وئەرکی شۆڕشگێڕەکان کە لە بواری چاکسازی کۆمەڵایەتیدا دەیدەن بە نەزۆکی دەزانێ ، بۆیە دەبێ راگەیاندن وئامانجەکانی رون ودیار بن .
هەندێک جار زانیاری لە سەرچاوەکانی خودی دوژمن وەردەگیرێ ، زۆر جاریش جوتیارەکان پیاوەکانیان نەک ژنەکانیان هەواڵ نێرو هاوکاری خەراپن . لە درێژە باسەکەیدا گیڤارا توێژینەوە لەسەر خۆبەخشەکان دەکا کە بنیاد نەری هێزی شۆڕشن ، دەڵێ : نابێ پلەی هەموو کەسێک بەرز بکرێتەوە تەنها هی ئەوانە نەبن کە شایەستەن ، واتە ئەوانەی لە مەیدانی شەر ئازایەتی ونەبەردی خۆیان دەسەلمێنن نەک لەسەر بنەمای سیستەمی لاسایی کەرەوەی کۆن کە لە نێو سوپای ولاتانی ئەمریکای لاتین پیادە دەکرێ .
هیچ هێزێکی شۆڕشگێڕ سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ ئەگەر فەرماندەکەی کاتی تەواوی پێ نەدا بە نهێنی مەشق نەکا . چونکە ئەرکی هێزی شۆڕشگێرەکان تەنها لێدانی دوژمن وسەرنگون کردنی رژێمەکە نیە ، بەڵکو پاراستنی دەستکەوتەکانە دوای روخانی رژێم ، دەبێ سوپا نیزامیەکە دوای سەرنگون کردنی رژێم بەرەو ماڵ بنێردرێتەوە ، ئەرکی پاراستنی دەسەڵات بە گەل بسپێردرێت کە خۆی لە هێزی جوتیارو کرێکارو سەربازدا دەنوێنێ .

لـه دوا بەنـدی پەرتوکـەکی ( شـەڕی پـارتیزان ) دا گیڤـارا بـاری ناهـەمواری کوبـا و دوارۆژی شـی دەکاتـەوە . باسـی دەسـتکەوتەکانی حکومـەتی شۆڕشـگێڕ دەکـا هـەر لـە کـاتی دەسـەڵات گرتنەدەسـتەوە تـا ئـەمرۆ . ئامـاژە بـەوە دەکـا چـۆن شـەرەکان ئـەو ئەنجامانـەیان سـەلماندن کـە ئـەو خـۆی دڵنیـا بـو ولـەوەی ئـەم چاکسـازیە رادیکالییانـە کـەڵێنێـک دەخاتـە نێـو هێـزی ئیمپریـالیزمی ئـەمریکی کـە بەسـەر حـوکمرانی کوبـادا زاڵ بوە .

بەڵام ئێستا کوبا نە پێویستیی بـە ولاتـە یـەکگرتوەکان هەیـە نـە لێشـی دەترسـێ ، چونکـە ئەو ولاتانەی لە ژێر چنگی ئیمپریـالیزم رزگاریـان دەبـێ لـە هێـزی داگیرکـاری کـۆن و نوێ نەترسن چونکە لە کـاتی شـەڕی رزگاریـدا دەیـان چەوسـێنێتەوەو مامەلـەی تونـدیان لەگەڵدا دەکا . دواتر گیڤارا باس لە سزا ئابوریـە کـانی ئـەمریکا دەکـا کـە بەسـەر کوبـا دا سەپێندراوە ، لە کاتێکـا دەبوایـە ئـەم فشـارو ئابلوقـە ئابوریانـە ئـابوریی کوبـا لـەناو بـەرن بـەڵام دور نیـە کوبـا بـە چـەک و سـوپای دەریـاوانی وچەکـە ئاسـمانیەکان گـەمارۆی ئەمریکا ی باکور بدا و زیـانی زۆری پـێ بگەیـەنێ . شـۆڕش بـە زینـدویی دەمێنێتـە وە چونکـە ئـەو گفـت وپەیمانانـەی بـە گـەلیان دابـون گەیاندیانـە جـێ بۆیـە ئـەوان تـا مـردن بەرگری لە شۆڕشەکەیان دەکەن .

سەرەرای ئەوەی دوا بەشی پەرتوکەکەی لە ماوەی رۆژگارێکی سەختدا نوسیوەتەوە کـە دەکاتە بەر لە گەمارۆکەی دورگەی بەرازان لە نیسانی 1961 بەڵام لە شێوەی گوتـاردا نەینوسیوەتەوە .

خاڵێک هەبوو مێشکی گیڤارای ئاڵۆز کردبو و پێیەوە گیری خواردبو ئەویش ئـەوە بـوو کە :

شۆڕش ناتوانێ بەرانبەر بە هێرشە ناوەخۆ و دەرەکیەکان خۆراگرێ تەنها بە هێنانـەدیی دەقاو دەقی ئەو پەیمانانە نەبێ کە بە گەلی دابون وکارێکی وا نـەکا جـەماوەر هەسـت بکا ئامانجەکانی شۆڕش ئامانجەکانی ئەوان نین و هەنگاوەکان لەگـەڵ داخوازیـەکانیان نایەنەوە دەبێ مانەوەی خۆیان لە مانەوەی شۆڕشدا ببیننەوە.

ئەو کاتەی شەڕی پارتیزان ئامانجەکەی دەبێتە هەڵگیرساندنی شـۆڕش ئـەو کاتـەی ئـەو جەماوەرەی پێشتر پارتیزانەکان چەکیان بەسەردا دابەش کردبـوون بـۆ ئـەوەی بـەرگری لـە دەسـکەوتەکانی شـۆڕش بکـەن ، دەبـێ ئـەوکات ئـەو جـەماوەرە بـە یەکـەوە راپـەرێ وبەشداری لە شۆڕش بکا ، دەبێ میلـەت بـە یەکپارچەییـەوە ببێتـە سوپای شـۆڕش و بـە هـەموو شـێوەکانی خـەبات و بـە هـەمان گیـانی قارەمـانێتیی پارتیزانـەکان بـەرگری لـە بستێکی خاکی نیشتمان بکەن .

لـە میانـەی بـاس کـردن ودرێـژە پێدانی بابەتەکـە گیڤـارا ئامـاژە بـە شکسـتی تـەواوەتیی گواتیمالا دەکا.

بـەهۆی ئـەوەی ئـەوکات میللـەت پرچـەک نـەکرابوو بۆیـان نـەکرا بـەرگری لـە رژێمـی ئەرنیتزی شۆڕشگێر بکەن .

ئەگەر بەراوردێک لە نێوان پەرتوکی (شەڕی پارتیزان ) ی گیڤارا و پەرتوکەکانی تری کە لەسەر سۆشیالیزم نوسراونەتەوە بکەین ، ئەوا پەرتوکی یەکەمی لەلایەن رۆژئاواییەکان بایەخێکی ئەوتۆی پێ نادرێ بە ئاستی پەرتوکەکانی تر بگا . چونکە ناوەڕۆکی پەرتوکی یەکەمی لەگەڵ بارودۆخی ئەوان ناگونجێ و دواتر هەندێک خاڵیش هەن لای ئەوان بە شێوازێکی تر چارەسەریان بۆ دۆزراوەتەوە . بەڵام لای وڵاتانی جیهانی سێهەم بە درەوشاوەترین پەرتوکی گیڤارا دەزاندرێت ، جگە لەو نامەی کە بۆ کۆنگرەی سێی کشوەرەکانی نوسیبووەوە .

کاتێک شۆڕشگێڕەکانی ئەفریکا ی باشور و ئاسیا و قولەرەشە خەباتگێرەکانی ئەمریکای باکور بیر لە گیڤارا دەکەنەوە ،لە میانەی پەرتوکەکەیدا بیری لێ دەکەنەوەو بە چاوی پەرتوکەکەیەوە هەڵی دەسەنگێنن . وێڕای ئەوەی ئەم پەرتوکە زانیاری ورێنمای‌یەکی گشتییان لەسەر شەڕی پارتیزان پێدەداو هەنگاو بە هەنگاو بەرەو سەرکەوتنیان دەبا .

لە پەرتوکەکەدا گەلێک جار ئەوە دوپات دەکاتەوە کە ئەوەی لە کوبا رویدا دەکرێ لە هەموو ولاتێک روبدا ، ئەگەر هەرچەندی رێژەکان بگۆردرێن ولەیەکیش دوربن .

شۆڕشگێڕەکان نابێ گوێ لە پاساوی پارتە کۆمۆنیستە لاسایی کەرەوەکان و کەسانی چەپ رابگرن گوایە بارو دۆخەکان بۆ شۆڕش گونجاونین یا کاتەکە نەگونجاوە بێ ئەوەی هیچ جولەیەک بەرەو دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتدا بکەن.

لەم بارەیەوە (چی) دەڵێ :

(پارت ومەزهەب و بیردۆزەکان بخەنە لایەکەوە چونکە شۆڕش تەنها پێویستی بە هەندێک پیاو و چەند پارچە چەکێک هەیە بە مەشق پێکردن وراهێنانیان لەسەر گیانی فیداکاریی روەو سەرکەوتن .

هەمیسان دەڵێ ئەوەی چەند کوبیەک ئەنجامیاندا ، هەموو کەسێک دەتوانێ ئەنجامی بدا ، ئەوەندە پێویستیی بە پشتگیری مادی وگەلەری ومەزهەبی نیە ، چونکە ئەگەر میلەت هەژار بوو لە خۆیەوە پشتگیری لە شۆڕش دەکا ، دواتر شەڕی رزگاری خۆی شۆڕشگێڕەکان فێری بیردۆزی گونجاو دەکا واتە شۆڕش خۆڕسک و خۆی بەخێو دەکا) .

هەر شوێنێکی گیڤارا سەردانی بکردبایە دانی بەوە دەنا کە شۆڕشی کوبا خاوەنی سێ فاکتەری گرنگ و بەهێز بوو بەهۆیەوە سەرکەوت ، ئەمانیش بریتی بوون لە :

1- فەرماندایەتی فیدل کاسترۆ .

2- ئامادە نەبونی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بۆ شەر.

3- ئاستی وشیاری جوتیارە کوبیەکان کە ئازاریان لەدەست سیستەمی کشتوکالی چێشتبو .

لەگەڵ ئەمەشدا دان بەوە دەنێ کە شۆڕشی کوبا تاکە شۆڕش نیە ، دەکرێ لە هەموو وڵاتێک دوبارە ببێتەوە ، چونکە هۆکاری هەڵگیرسانی شۆڕش لە هەموو ولاتێکی دواکەوتو و نیمچە پێگەیشتو بەدی دەکرێ ، ئەگەر هۆکارێک بونی نەبوو ئەوا هەر

دەبێ هۆکارێکی تری هەڵگیرسانی شۆڕش هەبێ ، کەوایە ئەوەی لە کوبا رویدا دەکرێ لە شوێنێکی تر روبدا ئەوەی بۆ ئەوێ گونجا لە شوێنێکی تر بگونجێ و جێبەجێ بکرێ .
رەخنە گرانی پەرتوکی ( شەڕی پارتی زان ) ئەم پەرتوکەیان بە پەرتوکێک ناوزەد کرد کە پریەتی لە رۆشنبیری وزانیاریی هەمە چەشن ، وا پێدەچێ مامەڵەی باشی لەگەڵ ئەو بارو دۆخانە کردوە ئەوانەی لەژێر کۆنترۆڵی کاسترۆ دەردەچون ، دیارە گیڤارا هیچ کاتێک ئەم رەخنانەی رەت نەکردونەتەوە چونکە شیکردنەوەی رووداوو بارو دۆخەکان تەنها بۆ هەڵسانگاندن و دیارکردنی سەرکەوتن وژێر کەوتنەکان بونە ، ئەوەی گیڤارا قەبولی نەکردوە تەنها ئەوە بو کە گوایە جیاوازی لە نێوان ئەزمونی کوباو ئەزمونەکانی تر دا هەیە و گوایە ئەزمونی کوبا ئەزمونێکی جیایە ولە دونیا تاکە .
بەڵکو ئەزمونی کوبا بکرێتە بنەمایەک بۆ هەمو بیردۆزەکانی گیڤارا ، بەڵام ئەو رای وابو کە دەکرێ هەموو دونیا سود لە ئەزمونی کوبا وەرگرن و جێبەجێی بکا .
هاربەرت ماتیوس لە پەرتوکی ( ریجی دوبریە) بەناوی( شۆڕش لە ناو شۆڕشدا) دەڵێ :
ئەم پەرتوکە هەموار کردنەوەیەکی نوێی نوسینەکانی گیڤارایە کە ئەوانیش لەراستیدا لە ناخی بیر وئەزمونەکانی کاسترۆ وەرگیراون و سەرچاوەیان گرتوە .
گومانی تیا نیە دوبریە لە باشترین خوێندکارەکانی گیڤارایە ، ئەمەو گیڤاراو فیدل کاسترۆ تا رادەیەکی زۆر لەسەر ئەو خالانە کۆک بون کە لە پەرتوکی ( شەڕی پارتیزان) کە لە سەر ئەمریکای لاتین هاتبون . بە بنچینە سیاسەتەکانی دەرەوەی فیدل کاسترۆ دادەنرێ .
لەگەڵ ئەوەشدا ستراتیژیەتی سەربازیی پەرتوکەکە ئەنجامی پسپۆریی هاوبەشی هەردوو پیاوەکەیە .
چەند مانگێکی دوایی لە ژیانی خۆیدا گیڤارا سەرۆکێکی سەربەخۆی کۆمەڵێک فیداکاران بو لێپرسراوێتی دورگەکە بە هەردوو پارچە کەیەوە پێی سپێردرابو کە بریارەکان بە سەربەخۆیی ولەلایەن خۆیەوە دەردەکران .
ئەوەی راستی بێ ئەوەیە گیڤارا ئەزمونەکەی کوبای لەگەڵ هەموو دونیا گونجاند جگە لەوەی کە گیڤارا دانەری ستراتیژیەتی سەرەکیی شەر بوو بۆیە بە دانەری بیردۆزەکانی دوای شەریش دێتە ئەژمار.
کارێکی سەختە مرۆڤ ئەوە لەیەک جیا بکاتەوە ئاخۆ کامیان سەرکردەی مەزنی سەربازی بون ، گیڤارا یا کاسترۆ ؟ هەردوکیان دوو دەنگی هاوتا بون ، شەڕی پارتیزان خۆی بریتی بوو لە پوختەی بیرۆکەکانی گیڤارا و کاسترۆ ی رەسەن کە لەسەر بنەمای ئەنجامەکانەوە سەرچاوەیان گرتبو ، هەموو ژن وپیاوێک دەبوایە بە راستیەکی بەڵگە نەویست بزانن . هەموو ئەوانەی لە شەری کوبیدا جەنگین بروای

تەواویان بەوە هەبو کە توانای هەڵگیرسانی شۆڕش و سەرکەوتن لە هەموو وڵاتەکانی ئەمریکای لاتیندا هەیە .
ئەو کاتەی فیدل کاسترۆ گوتاری بۆ دەخوێندنەوە دەی ووت :
دەبێ (کۆردیلو ئالاندیس) بکرێتە ئەلسیرا مایسترا ی ئەمریکای باشور بەڵام گیڤارا دەیویست لە رێگەی نوسینی نامیلکەیەکەوە توانای جێبەجێ کردنی ئەمە بسەلمێنێ و دواتر لە رێگەی نانەوەی شەرێک لە بۆلیڤیا جێبەجێی بکا . سەرکەوتنی ئەم نامیلکەیە جێی گومان و لێپێچانەوە نەبوو لە لایەن کڵاو سەوزەکان و هێزەکانی تایبەتی و هێزە دژە شۆڕشەکان لە ئەمریکیەکانی باکوری کە لای خۆیانەوە وەکو پەرتوکێکی خوێندنگایان دەناسی .
وێڕای ئەمەو لە کۆتاییدا بە شێوەیەکی تاقانە گیڤارا وەکو فەیلەسوفێکی شۆڕش دێتە بەرچاو زیاتر لەوەی وەکو مامۆستایەکی پراکتیک بێ .
وەکو فیدل کاسترۆ لە پرسەی گیڤارا لە 18ی ئۆکتۆبەری 1967 دەڵێ :
کاتێک یادی گیڤارا دەکەینەوە و ناوی دەهێنین تەنها لەبەر چاکەو چالاکیە سەربازیەکان نیە ، نەخێر شەر دوا قۆناغ نیە بەڵکو تەنها ئامرازێکە ، واتە شەڕ ئامرازی شۆڕشە ، گرنگی شۆڕش وپرسی شۆڕشگێڕیە رێبازو روداوە شۆڕشگێڕەکان ویژدانی شۆڕش وچاکەو چالاکیەکانیەتی .
شەڕی پارتیزان تەنها نامیلکەیەک نیە بەڵکو ململانێیەکی تری روی شۆڕشە ، گیڤارا بنەمای بڕواکانی لەسەر سێ خاڵ سەرچاوەیان گرتبوو کە بریتین لە :
1 – هێزەکانی گەل دەتوانن سوپاکان لە ناو بەرن .
2- کلپەو شانەکانی شۆڕشگێڕان لە توانایاندایە درێژە بە شورش بدەن و لە ناوچەکانی تری بڵاوکەنەوە .
3 – سەرکەوتنی شۆڕش لە گوندەکان مسۆگەرە.
ئەم بڕواو بنەمایانە رەت کردنەوەی راشکاوانەی بیردۆزی بەلشەفی و پارتە کۆمۆنیستەکانن ، خەتەرناکی ئەم بیردۆز وبنەمایانە ئەو کاتە دەردەکەوتن کە جیا بونەوە لە نێوان چین و سۆڤیەت رویدا .
جیاوازی لە نێوان بیردۆزەکانی ماوتسی تۆنگ وگیڤارا تەقینەوە ، بەڵام لەسەر شێوازی شەری پارتیزانی هەردوکیان هاورا بون . جگە لەمە لەسەر ئەوەش هاو راو کۆک بون کە ناوچە گوند نشینەکان ناوچەی گونجاون بۆ شەڕی پارتی زانی ، ئەمە سەرەرای ئەوەی گیڤارا و شۆڕشگێڕە کوبیەکان دەڵێن ئێمە لەو کاتەی لە رێگەی شەڕی پارتیزانیەوە بەسەر باتیستا سەرکەوتین بەڵام هیچ ئاگاداری و زانیارییەکمان لەسەر ئەزمونی چینی نەبوە .
دور نیە ئەم گوتەیان راست بێ ، هەر چەندە کوبیەکان لەسەر ئەوە پێداگر بون کە شۆڕشەکەیان مۆرکێکی شۆڕشگێڕی تایبەتیی پێوەیە ، بەڵام گەلێک لەیەک چون بەدی دەکرێ لە نێوان خەباتی کوبیەکان و خەباتی چینیەکان .
ئەمە ئەو ئەنجامەیە کە سەرکردەکانیان لەم بارەیەوە بەدەستیان هێناوە .

هەردوكیان لە وەدەست هێنانی هاوكاریەكانی دەرەكی سەركەوتو نەبون و لە روبەرو بونەوەشدا لەگەڵ سوپای نیزامی شكستیان هێنا بەڵام توانیان لە ناوچە گوند نشینەكاندا خۆیان راگرن وبەرگری بكەن ، ئەمەش بە پشتگیری و هاوكاریەكانی دانیشتوانی ناوچەكە بوە كە بەهۆیەوە شكستیان بە سوپای نییزامی هێناوە .
ئەمە بوهانی هەردوو شۆڕشەكەی دا كە چاكسازی كشتوكاڵی بكەنە ئامانجی سەرەكی خۆیان و جوتیار لە شوێن پڕۆلیتاریای شارستان دابنێن وەكو چینێكی شۆڕشگێڕی نوێ لە هەریەك لە چین وكوبا .
ئەو راستیە لەوە دەركەوت كە سەركەوتنی شۆڕش لە كوبا بەبێ پشتگیری پارتی كۆمۆنیستی كوبی هاتە دی ، نەك تەنها ئەوەندە بەڵكو بەر لەوەی پارتی كۆمۆنیست ئەمە بكاتە رێبازی خۆی ئەم سەركەوتنە هاتەدی ، دیارە ئەمەش بەر لە هەموو شتێك ئەو راستیە دەردەخا كە پۆلاینی بیردۆزەكانی گیڤارا دەسەلمێنێ ئەوانەی لە پەرتوكی ( شەڕی پارتی زانەكان ) ئاماژەی پێداون ، لە راستیدا تەنانەت چینی یەكانیش زاتی ئەوەیان نەبوە ئەم بەهرەیە بخولقێنن.
ئەم ئەزمونەی گیڤارا بوە مایەی مژدە بەخش بۆ سەربەخۆ بونی كۆمەڵێك لە شۆڕشگێڕ ئەوانەی لە دەرەوەی بازنەی پارتە كۆمۆنیستەكانن كە بتوانن ئازادی وەدەست بێنن ، بەتایبەت لە شارەكان .
ئەم بیردۆزە زیاتر لە سەردەستی دوبریە گەشەی پێدرا كە لە پەرتوكی( شۆڕش لە ناو شۆڕشدا ) ئاماژەی پێدراوە ، لەم پەرتوكەیدا باس لە یەكێك لە دولەت بون دەكا كە لە نێوان ئاژاوە گێرەكان ومارکسیستەكان لە سەدەی نۆزدەهەم رویدا .
ئایا رەوایە خەباتی شۆڕشگێرانە لە لایەن رێكخراوێكی مەركەزیی پارتێك ئاماژە و ئاراستە بكرێ ؟ یا دەبێ لە رێگەی ئەو كەسانەوە ئاراستە بكرێ كە لە شوێنی ئۆپەراسیۆنەكانی سەربازی دەجەنگن ؟ ئەم دەستپێشخەریەی كوبیەكان كە لە گەورەیی گیڤاراوە بەدی دەكرا شۆڕشگێڕەكان پێی مەزن بون .
لە وتارێكیدا بەناوی ( جەنگاوەری شۆڕشگێڕ كێیە ؟) لە 1959 گیڤارا تیایدا وێنەی پاڵەوانێكی نمونەیی دەكێشێ و بە فریشتەی ئارام ناوی دەبا كە بۆ یارمەتی دانی هەژاران لەسەر زەوی نیشتۆتەوە .
بۆیە جەنگاوەری شۆڕشگێڕ وەكو شتێكی پیرۆز وایە ، واتە دیاریی ئاسمانە لە شێوەی رۆبن هود هاتۆتە خوارەوە یا ئەو رزگاركارەیە كە تەنانەت لەگەڵ دوژمنەكەشیدا بە جوامێرانە مامەڵە دەكا .
ئەگەر ئەم دیمەنە جوان وپیرۆز و پڕ لە تەكتیكانە بخەینە سەر رەوشتی شۆڕشگێڕەكان ئەوا دەبێ وێنەی فیداكارەكان لە شوێن وێنەی قەشەكان هەڵواسین .
ئەم دەستەواژەی پارتیزانەكان دورە لە دەستەواژەی تاوانبارێكی سەرەرۆ كە لە دارستانەكان بۆ رێگەگرتن خۆی مەلاس داوە بۆ نانەوەی ئاژاوەو خەراپكاری لە ناووچەكە ، جیاوازیش لە نێوان ئەم وئەو وەكو جیاوازی لە نێوان رزگاركار و

داگیرکار وایە ، دیارە وێنەی قەشە کریستیەکان کە لە کەلیساکانی ئەمریکا وێنەیان هەڵواسراوە بۆ هێنانەوەی پاساوە لە کارەکانی پێشویان .
پێدانی وێنەیەکی نمونەیی بە شۆڕشگێرەکان مانایەکی سیاسی دەبەخشێ ،
ئەمە دەبێتە یاریدەدەر بۆ وەدەست هێنانی فیدل کاسترۆ و هەڤاڵانی لە شۆڕشی ( ئەلیسترا مایسترا ) کە بتوانن پلەو پۆستی بەرز لە حکومەتە نوێکەی دوای روخانی باتیستا وەدەست بێنن .
ئەم تایبەتمەندیەی شۆڕشگێرەکان بوە پاساوێک بۆ ئەوەی رێگە بە خۆیان بدەن هەمو سیاسەتمەدارە میانرەوەکان و ئەوانەی لە چیاکان نەدەجەنگین لەسەر کار لابەرن و پۆستەکانیان لێ بسەننەوە ، واتە پێدانی سیفەتی پاڵەوان بە شۆڕشگێرەکان ئامانجی هێنانەوەی ئەو بیانویە بوو کە بەهۆیەوە گیڤارا و هەڤاڵانی توانیان لە کوبا دسەڵات بگرنە دەست .
گیڤارا دەنوسێ ودەڵێ ( باشترین مەشق بۆ سەربازی شەڕی رزگاری ، بەڕێوە بردنی شەڕی پارتیزانی یە . ئەو فەرماندەی لە میانی هەڵگرتنی چەکدا فێری ئەرک و کارەکەی خۆی نەبوە ، ئەوە فەرماندەیەکی رەسەن و سەرکەوتو نیە ).
ریجی دۆبریە کاتێک بۆ ئەو پیاوە دەنوسێ کە لە ( ئەلسیرا مایسترا) جەنگاوە جەخت لەو خاڵە دەکاتەوەو دەڵێ :
( لە پێناو ئەوەی بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ بن و سەرکەون هەموو ژیانی خۆیان لە روی ستراتیژەوە خستە مەترسی ، لە کۆتاییدا شایەنی هەموو شتێک بون ) .
سەرکردەکانی پارتی کۆ مۆنیستی کوبی بە هەموو شتێک خۆیان نەخستە مەترسییەوە نەک تەنها ئەوان بەڵکو سیاسەت مەدارە دورخراوەکان و کۆمەڵەی دیموکراتخوازەکانیش ئەوانەی دژی باتیستا بون .
ئەوانە تەنها شایەنی ئەوەن پلەیەکیان لەوانە نزمتربێ کە رەنجی خەباتی خۆیان وەدەست هێنا .
گیڤارا لە وتارەکەیدا کە لە ساڵی 1959 نوسیویەتەوە سەرکەوتنی گەلی کوبی بەم شێوەیە باس لێوە دەکا گوایە ( هەموار کردنی بیروراکانی کۆنە ) بیرو رای کۆن هی ئەوانە بوو کە بانگخوازی شۆڕشیان دەکرد ، بەلام رۆژی هەڵگیرساندنیان رۆژ لە دوای رۆژ دوا دەخست بە بیانوی نەگونجانی کاتەکان کەچی تائێستاش ئەو کاتە گونجاوە هەر نەهات. ئەوان لە دوا ساتەکانیدا دەستیان بە ئەستێرە سورەی کەسک وسور کەوت .
ئەو ئەندامە بۆگەنانە بەراستی ئەندامی پارتە کۆمۆنیستەکانی ئەمریکای لاتین بون .
گیڤارا لەو کاتەوە روبەرو بونەوەی لە نێوان لایەنگرانی شێوازی ئاشتی وشێوازی توند وتیژی بۆ دەسەلات گرتنەدەست، ئەنجام داوە .
تارادەیەک مەزهەبی گیڤارا لە هێرشی شەری پارتیزانەکان کۆتایی بە پارتە کۆمۆنیستە لاسایی کەرەوەکانی ئەمریکای لاتین هێنا . بە شێوەیەک کاریگەریی لە

کۆتایی هێنان بە رۆلی ئەوان هەبو کە لە رۆڵی حکومەتە سەربازیە چەوسێنەرەکان زیاتر بوو .
گەڵێک جار گیڤارا ئەمەی دوبارە دەکردەوە کە کاریگەری فکر لە کاریگەری فەوجێک زیاترە ، لە ئەمریکای لاتین لایەنگرانی بیردۆزەکانی گیڤارا لە لایەنگرانی پارتە کۆمۆنیستە کلاسیکیەکان جیا بونەوە.
نمونەی ئەزمونی کوبا بوە هۆکاری ناکۆکی وململانێ لە نێوان ئۆرگانە رادیکالیستەکان لە ئەمریکای لاتین کە گەڵێک لە جیابونەوەی روسیاو چین توند تر بوو .
سەرەرای ئەوەی روسیا پشتگیری لە لایەنگرانی گۆڕانی ئاشتیانە دەکرد بۆ حکومەتەکان ئەمەش لە رێگەی هاندان وپستگیری کردنی تێکهەڵچونەکانەوە بوو .
بەڵام چینیەکان پشتگیریان لە گۆران بە شێوازی توندو تیژی دەکرد کە لە رێگەی هاوکاری کردنی شەری پارتیزانیەوە دەبوو .
ئەمەبوە مایەی چر بونی ناکۆکی و دوبەرەکی لە نێو رادیکالیستەکان. دەکرێ بڵێین میلی کاتژمێرەکەی بۆ چەند ساڵێک دواخست . جگە لەمە بوە هۆکاری شکست هێنان بە گیڤارا لە بۆلیڤیا و دواتریش کوژرانی . بەڵام دەبێ بزانین ئەمە مەحاڵ بوو هەر دەبوایە بۆ بەرژەوەندی دوارۆژ لە نیمچە کشوەر روبدا .
لە نێوان هەرسێ چاودێرە سەرەکیەکەی پرسی شەڕی پارتیزان هەریەک لە کاسترۆ وگیڤارا و دوبریە ، گیڤارا لە هەمویان گرنگتر بوو ، لە هەموشیان دیارتر بوو یەکەمیشیان بوو لەو پرسە بکۆڵێتەوە هەروەها یەکەم کەسیشیان دەبێ کە لە پێناو سەلماندنی راست و رەوایی دۆزەکە هەموو شتێک بەختکا و هەر خۆشی دەبێ سەر لە پێناو ئەم پرسە دادەنێ وگیانی دە بەخشێ .
بەڵکو کۆمۆنیستە کلاسیکەکان بتوانن بەرانبەر بە هێرشی ئایدیۆلۆژیای شەڕی پارتیزان خۆیان راگرن ، بە چاوی خۆیان نمونەی شۆڕشی کوبی ببینن کە بەدەستی هێزەکانی حکومەت شکست دەخۆن ، بەلام دەبێ بە مسۆگەری ئەوە بزانن کە بەرانبەر بەو تۆمەتانەی لە خودی گیڤارا خرانە پاڵیان خۆیان راناگرن ، گەرانەوەی گیڤارا بۆ مەیدانی شەرو کوژرانی لەو شوێنە شەرمەزاریە بۆ ئەوان .
پەرتوکی (شەڕی پارتیزان) لە کاتی دەرچونیدا دەنگ و سەدای لە هی بەیاننامەی کۆمۆنیزم زیاتر بوو .
گەڵێک پیاوی خوێندکار ئەوانەی بروایان بە نوسینەکانی گیڤارا هێنابو بەشداریان لە شەڕی رزگاریدا کرد . گەڵێک جاریش شارو دانیشگا وشارە پێشکەوتوەکانیان دەکردنە ئامانج و لەوێ دەستیان بە خەبات دەکرد ئەمە لە جیات ئەوەی رو لە چیا ودارستانەکان بکەن لە شارەوە خەباتیان دەست پێدەکرد . ئەگەر دەستیان هات وسەرکەوتنیان بەدەست هێنا ئەوا گیڤارا رێگەی پێداون درێژە بە خەباتیان بدەن تا ئەو کاتەی دەتوانن بە تەواوەتی دەست بەسەر دام ودەزگاکانی حکومیدا بگرن.

گوێی بەو تۆمەت ودەستەواژەیە نەدا کە دەزگاکانی دیموکراتی وپارتە سیاسیەکان دەیاندایە پاڵ ، گوایە هەڵپەرستە . گیڤارا دەسەڵاتی زۆری بە شۆڕشگێڕەکان دابو کە گاڵتە بە ئیرادەی پارتە کۆنەپەرستەکانی ولات بکەن .
چونکە بە مافی ئەوانی دەزانی وبەڵکو بە ئەرکی ئەوانیشی دەزانی کە رێکخستنە شۆڕشگێرەکەیان شوێنی دەسەڵاتی حکومەت و حزبە کلاسیکەکان بگرێتەوە .
بە دیدی گیڤارا دەبێ شۆڕشگێڕەکان بجەنگن و سەرکەون و بە پاڵپشتی گەل دەسەڵات بگرنە دەست .
حکومەت وپارتە کۆنەکانیش کە پشتگیری گەلیان لەدەست داوە دەبێ پەراوێز بخرێن و لەناو بچن ، شەڕی پارتیزان فەرماندە دێنێتە بەرهەم .

---

بەشی چوارەم

## گەشەکردنی کاروانی شۆڕشی کوبی

بۆ هاتنی گەنجە شۆڕشگێڕەکان بۆ ناو هاڤانا 5 ساڵ پێش روخانی باتیستا لە 1959 کاسترۆ ئامادە باشیی بۆ دەستەبەر کردبون . کاتێک باتیستا کاسترۆ لە زیندان ئازاد دەکەن ، رایدەگەیەنن کە (شەرەکەیان ئاهەنگ وپشودان نابێ بەڵکو خەبات وئەرکە) ، ئەوکات زۆربەی هەڤالەکانی کاسترۆ ئامادەی ئەو ئەرک وخەباتە نەبون بۆ بەڕێوە بردنی وڵات . بەڵام گیڤارا لەو کەم کەسانە دەبێ کە ئامادە باشیان تیا دەبێ ، سەرەرای ئەوەی ئەگەر شارەزاییەکی ئەوتۆشی نەبو لە بواری ئابوری ودبلۆماسی وئیدارە وسیاسەت بەڵام پیاوێکی خاوەن فەلسەفەو رەوشەنبیر بوو ، بە پێچەوانەی قارەمانە نەخوێندەوارەکانی وەکو جوان ئەلمیداو کامیلو سوینفیگوس بو توانا و زیرەکی خۆی لە بەرێوە بردنی ئەلسیرا مایسترا دەرخستبو .
لەگەڵ ئەوەشدا ئەرک و رۆلی گیڤارا لە ناو حکومەتەکەی کاسترۆ گەلێک لەو دایهێنانە کەمتر بون کە لە مەیدانی خەبات فێری ببو و پیادەی دەکردن . هەروەکو چۆن گیڤارا ئاوێنەی شۆڕش بو ئاوەهاش ئاوێنەی حکومەت بو .
هەندێک راو بۆچونی جیا لەسەر بایەخ دانی گیڤارا بە رژێمی حوکمی فیدل کاسترۆ هەن ، بە دیدی هەندێک لە رەخنە گرانی رژێم گیڤارا تاقە کەسێکە بتوانێ بنیاتی ئایدیۆلۆژیایەک بنێ وبەرنامەیەکی توکمەکراو بە شێوەیەکی بەردەوام بۆ شۆڕش دارێژێ .

جوانای خوشکی کاسترۆ که دوای سەرکەوتنی شۆڕش لەگەڵ هەندێکی تربۆ دەرەوە کۆچ دەکا ، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە گیڤارا بوو ئەو گۆڕانەی بەسەر شۆڕشگێڕەکاندا هێنا ووای لێ کردن کۆمۆنیزم وەکو بروا جێبەجێ بکەن .
لەلایەکی تریشەوە هەندێک لە مێژونوسی تر هەن تەنها رۆڵێکی سانەوی بە گیڤارا دەدەن ، بە دیدی ئەوان گیڤارا هیچ رۆڵێکی جەوهەریی لە ئاراستەکانی ئەزمونی کوبادا نەبوە وگوایە ئەو بیرۆکەو بیردۆزانەی لای گیڤارا بون هەموی لە سەرچاوە جیا جیاکانەوە وەرگیراون ، بەدیدی ئەوان گیڤارا تەنها وەرگێڕی کاروانی شۆڕشی کوبا بوە .
بەڵام راستیەکە لە نێوان هەردوو رادا جێگیر بوە ، شتێکی شاراوە نیە گیڤارا بە ئاستێک بەشداریی لەشۆڕش کردوە کە رۆڵی لە رۆڵی فیدل کاسترۆ کەمتر نەبوە ، چونکە بە بێ شی کردنەوەو رێرونیەکانی گیڤارا وشیاری لە کارەکانیدا وەکو ( پیاو وسۆشیالیزم لە کوبا ) ئەوا کوبا بەدەست نەبونی ستراتیژیەت و تۆباویەتەوە دەینالاند .
فیدل کاسترۆ بەهۆی ئەوەی کەسێکی پارێزەر ویاسا ناس بوە ، کاروبارە یاساییەکان وگوتارخوێندنەوە و بەرگری کردن وهێرش بردن وەکو کەسێکی سوێند خۆر بەو سپێردراوە ، بەڵام گیڤارا پزیشک بوەو کاری دەست نیشانکردنی نەخۆشی و چارەسەر کردنیش بەو دەسپێردرا ، لای گیڤارا ئەم ئەرکە مانای مردن و ژیانی دەبەخشی .
لە میانەی شوێن و کەسایەتیی هەر یەکەیان کاسترۆ و گیڤارا هەلوێستی جیا دەنوێنن ، دەبوایە کاسترۆ لەسەر درێژە پێدانی شۆڕش وپاراستنی دەستکەوتەکانی وپاراستنی ئابوریی دورگەکە لە روخان بەردەوام بێ ، دەبوایە تایبەتمەندیە سیاسیەکان لە پێناو پارستنی ئاسایشی ناوەخۆ و قەرزە دەرەکیەکان بکاتە فەرمان و کاریان پێ بکا .
دەبوایە لەگەڵ هێزە رکابەرەکانی هاوشان بێ وئاسۆی گەلی کوبی و رەخنەو گلەییەکان بەرچاو بگرێ . هەروەها دەبوایە بێ ئەوەی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بوروژێنێ ولەخۆی بکا بە دوژمن وپاساوی دەستێوەردانی بداتە دەست و هاوکاریەکانی روسیا وەدەست بێنێ .
دۆخەکە بە شێوەیەک گۆرا کە کارەکانی رۆژانەی وڵات لەگەڵ کات وبایەخەکانی کاسترۆ هاتنەوە ، ئەوکاتەی کاسترۆ گیروگرفتەکانی ئەلسیرا مایسترا و دواتریش هاڤانای چارەسەر دەکردن ، گیڤارا هەول و تواناکانی لە بواری دۆزینەوەی بیردۆزێک چڕ کردبوەوە کە ئەو بڕوای پێبوو ببێتە چارەسەری، شایەدی هەواڵنێران ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو کاتەی کاسترۆ لە چیاکان دەجەنگی شێوەی حکومەتە کەی حالی حازری لەبەر چاو نەبوە ، لەم روەوە هربرت ماثیوس دەنوسێ و دەڵێ :
فیدل کاسترۆ زۆر بە دڵ فراوانیەوە بڕوای هێنا ، من لێرە ئەو وتەی کاسترۆ بەکار دەهێنم کە خۆی بە منی ووتوە:
شۆڕشگێڕەکان دەتوانن شۆڕشێکی رادیکالیی کۆمەلایەتی هەڵگیرسێنن بە رێگەیەکی دیموکراسیانە چونکە ئەمە ئامانجە سەرەکیەکەی شۆڕشە . دیموکراسیەت زۆر بە ئاسایی ئەو رێگەیە بو کە ئەوان مەزندەیان دەکرد دەتوانن پیادەی بکەن .

ئەو کاتەی روبەرو بونەوە رویدا ، شێوازی جێبەجێ کردنی گۆڕی نەک ئامانجەکە، دواتر چونکە گیڤارا هەمیشە ئەوکەسە توندرەوە بوو لەسەرسەرکردە چەپرەوەکانی شۆڕش ، دواتر هۆکاری روبەرو بونەوەی فیدل کاسترۆ لەگەڵ پێشوەچونەکانی دیموکراسی و چەواشەکاریەکانی ئامانجی شۆڕش بەشێکی دەگەرێتەوە بۆ گوێ رایەڵیی کاسترۆ بۆ ئامۆژگاریەکانی گیڤارا .

لە ساڵەکانی سەرەتایی شۆڕشدا فیدل کاسترۆ و بزوتنەوەکەی هاوکاربون بۆ دامەزراندنی حکومەتێک لە میانرەوو لیبرالیستەکان ئەوانەی خاوەنی ناوبانگێکی پاک بون لە ئۆپۆزسیۆنەکانی باتیستا .

ئەوەندەی نەبرد ئەم کۆمەلە کەسانەی کە بە زەروریان دەزانی ئەو پەیمانانەی بە جوتیارە کوبیەکان درابون دەبێ جێبەجێ بکرێن، لەگەڵ سەرکردە توند رەوەکانی شۆڕش توشی روبەروبونەوە هاتن ، ، دیارە کە چاکسازیەکانی رادیکالیستەکان پێویستی بە رەفتاری توند هەبوو ، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت فیدل کاسترۆ دەست لە هەموو میانرەوەکان هەڵدەگرێ و هەڤالەکانی خۆی لە ئەلسیرا مایسترا دێنێتە پێش .

وەکو کە سیلیاس دەگێرێتەوە وا بیریان دەکردەوە کە ئەوان لە رێگەی میانرەوەکانەوە حوکمرانی دەکرێن بەڵام بۆیان دەرکەوت خۆیان بونەتە مەزنی دورگەکە . لەو کاتەوە بیرۆکەی حکومەتی شۆڕشگێران لای گیڤارا گەڵالە دەبێ ، لە کاتێکا جێبەجێ کردنی ئەم بیرۆکەیە پێویستی بە گۆرانکاری رادیکالانە هەبوو ، ئەم ئەرکەش بە سەرکردەکانی شۆڕش نەبێ بەکەس ناکرێ .

شی کردنەوەی ئەو شەش ساڵەی کە گیڤارا دوای ساڵی 1959 لە کوبای بردە سەر لە راستیدا ئەمە مێژوی شۆرشی کوبی بوو .

کاتێک جون پۆل سارتەر ووتی :

گیڤارا لە هوموو پیاوەکانی سەردەمیدا تەواوترە ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە گیڤارا لەگەڵ وشە تایبەتیەکانی خۆیدا ژیاوە ، لەسەر کارەکانی خۆیشی دواوە ، بە رادەیەک کە مێژوی تایبەتی خۆی وکۆمەڵگاکەی لەسەر هەمان چیرۆک دەدوێن .

ئالۆز کردنی شۆڕشی کوبی لەروی رەسەنایەتی وئەزمونیەوە ئاوێنەیەکی رەشی گیڤارا دەگەیەنێ ، لە کاتێکا گیڤارا خەریکی بەرجەستەکردنی شۆڕش دەبێ کاچی شۆڕش گیڤارا بەرجەستە دەکا ، نوسین و کردەوەکانی گیڤارا لەشەش بواردا بونە بنەمای ئەزمونی کوبی کە بریتی بون لە بواری کشتوکاڵی وپیشەسازی وسیاسەتی دارایی و پاداشتە رەوشتیەکان و وشیاریی شۆڕش وکاروباری نێودەولەتی .

بە شێوەیەکی گشتی کوبا کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵیی هەبوو ، دەبوایە شۆڕشی کوبی شۆڕشێکی کشتوکاڵی بوایە . هەریەک لە ئابوریی دورگەو هەستی جەنگاوەرەکان لە ئەلسیرا مایسترا پاڵپشت بون لەو سیاسەتەی پیادە دەکرا کە گرنگی دان بوو بە گوندەکان .

داهاتی شەکر سێ لەسەر چواری داهاتی ولاتی پێک دەهێنا ، ئەمەش بە پارەی بێگانە دەهاتە ناوەوە ، مەرجی بەرەو پێش چونی کوبا بە بەرهەمی شەکرەوە بەسترابوەوە

لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو كرێكارانـەی خـاوەنی زەوی نـەبون وكـاری وەبەرهـەمهێنانی شەكریان دەكرد مامەڵەكردن لەگەڵیاندا لە مامەڵەی ئاژەڵ خەراپتر بوو كـەچی كرێكـارە شارنشینەكانی تر لەو پەڕی خۆشیدا دەژیان.
شۆڕش پێویستیی بـە پشتگیری و هاوكـاری جوتیارەكـان بـوو ، بیرەوەریـەكانی شـەڕی چیاو بەرز نرخاندن و ووتە رازاوەكانی گیڤارا لەسەر جوتیارەكـان و پێناسـەكردنیان بـە چینـی شۆڕشـگێرتاقە هەستێكی مایـەی پاشـخان و هانـدانی زەرورەتـە سیاسیەكان بـوو . پێشتر لـەو ناوچەیـە كـە شۆڕشـگێرەكان دەستیان بەسـەرداگرتبوو چاكسـازی كشـتوكاڵی لەوێ ئەنجام درابوو ، بەڵام كاتێک دەبینن ئێستا هەموو دورگەكە لە ژێر دەستی ئـەوان دایە دەبێ چاكسازی كشتوكاڵی هەموو دورگەكە بگرێتەوە .
گیڤارا زۆر بە رونـی باسـی لـەو كارتێكردنـەی نێوان پێویستی وسیاسـەتەكانی شۆڕش وجوتیارەكان دەكرد.
ئەو پیاوانە دوای دوو ساڵ لە خـەباتی سـەختی چیا ودەشتاییەكانی (ئوریـەنتـە) و دۆڵـی كامو جوبە لە چیا ودەشت و شـارەكانی لاس فیجاس هوە هاتنـە هاڤانـا ، ئەمانـە لـە روی ئایدیۆلۆژیاوە هەمان ئەو پیاوانە نەبون كە لە قۆناغی یەكەمی خەبات بەشداریان كردبو یا ئەوانەی لە كەنارەكانی لاس كولارادوس دابەزین . ئـەوان ئـەم ناشـارەزاییەیان بۆ بـو بـە خۆشەویسـتی وریـز لێنـان ، ناشـارەزاییان لەسـەر ژیـانی گونـدەناک لـێ بـو بـە شـارەزایی لەسـەر پێویستیەكانی كرێكـارە بـێ زەویـەكان، رۆژ لـە دوای رۆژ لـە میـانی كـاری پراكتیكـی زیـاتر زانیاریـان لەسـەر ئامـارو لایەنـە تیـوری وپراكتیكیەكـە پەیدا دەكـرد ،. ئـەوان لـە ئەلسیرا مایسـترا بـە دروشـمی چاكسـازی كشـتوكاڵی روبـەروی ئیمپریـالیزم بونـەوە ، لـەوێوە دەسـتیان بـە جـێ بـەجێكردنی كـرد ، خۆیـان لـە ئاكـامی كارەكەیان دەگەیشتن ئەمەیان لا رون بوو كە لە رێگەی ئەم پرۆسـەیەوە دەتـوانن دەست بەسەر زەویەكانی دەرەبەگەكاندا بگرن و دواتر بەسـەر جوتیـارە بـێ زەویەكانـدا دابـەش كەن ، ئیتر ئەوكات جوتیارەكان دەكەونە ئەو بروایەی كە شۆڕشگێرەكان لە پێنـاو گەلـدا خۆیان بەخشیوەو خەبات دەكەن .
لەم برگەیە گیڤارا ئاماژە بە سێ خاڵی گرنـگ دەدا :
یەكەمیان / ئەوانەی شۆڕشگێرەكانیان پێک هێناوە جوتیارەكانن .
دوەمیان/ چاكسازی كشتوكاڵی لە میانەی شەردا دەستی پێكردوە .
سێیەمان/هێرش بردنە سەر ئیمپریالیزم ئـەوە دەگەیـەنێ كـە كۆتاییـەكی رواڵەتیـە بـە جـێ بـەجێ كردنـی چاكسـازی كشـتوكالی چونكـە ئـەم پرۆسـەی چاكسـازیە پـەیمانێک بـوو شۆڕشـگێرەكان بـە جوتیارانیـان دابـوو لـە هـەمان كاتیشـدا زەرورەتێكـی نـاوەخۆیی و سیاسەتێكی دەرەكیش بوە .
گرنگترین بریـار كـە لـە حكومـەتی شۆڕشـگێرەكان دەرچـو ئـەم بریـارەی چاكسـازی كشتوكاڵی دەبێ كـە لـە ئایـاری 1959 دەرچـو . ئـەو كـات هـەموو كێڵگـە مـەزن ومولكـە بنچینەییـەكان خۆمـاڵی دەكـرێن . وێـرای ئەمـە سیاسـەتێكیان بـۆ ئـابوری دارشت كـە بـە پێیـەوە نـابێ تـەنها پشـت بـە یـەک جـۆرە بەرهـەم ببەسـترێت ، بـەڵكو سیاسـەتی فـرە

بەرهەمی پیادە بکرێ ، ئەمەش بۆئەوەی لە چوار وەرزی ساڵدا بێکاری نەمێنێ ، بۆ ئەم مەبەستە هەرەوەز و کێڵگەی حکومی وەکو نمونە دامەزرێندران، ئەو جوتیارە بچوکانەی خزمەتی ئەو زەویانەیان دەکرد کە لە ژێر دەستیان مابونەوە، مەشق وراهێنانیان بۆ فەراهام کردن بۆ ئەوەی فێری شێوازی نوێ بن لە چاندن و وەبەرهێنان .

بۆ یەکەم کاریگەریی چاکسازی کشتوکاڵی لە کوبا گیڤارا وەها دەڵێ :

چاکسازی کشتوکاڵیی رادیکالیزم تاقە شێوازە بتوانێ زەوی بە جوتیارەکان بدا ، چونکە ئەم پرۆسەیە راستەوخۆ لەگەڵ سەرمایەدار ودەرەبەگ و مەردارو شەکردارەکان روبەرو دەبێتەوە دیارە ئەم توێژەش کە خۆی لە چینی بۆرجوازی دەنوێنێ لە روبەرو بونەوە لەگەڵ چینی پرۆلیتار دەترسێ بەم شێوەیە و بەم پرۆسەیە ریزەکانی جوتیارو کرێکارەکان یەک دەخرێن .

کرێکارەکان پشتگیری لەو داخوازیانە دەکەن کە دژی گەورە سەرمایەدارەکان بەرز دەکرێنەوە ، جوتیارە هەژارەکەش کە لە رێگەی شۆڕشەوە بۆتە خاوەن زەوی پشتگیرو پاڵپشتی شۆڕش دەبێ و دژی ئیمپریالیزم ودوژمنان دەوەستێتەوە .

ئەم دەستەواژەو دەربرینە گۆرانێکی لە هزرەکانی گیڤارا و شۆڕشی کوبا خولقاند . گیڤارا کەوتە ئەو بروایە کە ئەو دوو چینەی پاڵپشتیان لە شۆڕش کرد چینی جوتیارو کرێکاری شارەکان بون . جوتیارەکان لە سەرەتای شەرەکان زۆر بە دڵسۆزی هاوکاری وپشتگیریان لە شۆڕش کرد . کرێکارەکانی شاریش لە قۆناغەکانی دواییدا روبەرو بونەوە لە گەڵ دوژمنانی هاوبەشیان هاورێی جوتیارەکان بون وبەرگریان لێ دەکردن، دوژمنە هاوبەشە کانیشیان بریتی بون لە :

مولکدارە کانی زەوی و بەرژەوەندیەکانی بێگانە و بۆرجوازەکان ، دیارە ئەمانەش ئەو چینە بون کە چاکسازیە رادیکالیستەکە کردنی بە دوژمنی شۆڕش .

بەر لەم قۆناغە شۆڕش وا دەناسرا گوایە شۆڕشێکی بێ چینایەتیە و جوتیارەکانیشیان بە چینی پێشڕەو ناو نابو ، بەڵام پێدانی ئەم نازناوە بۆرجوازە باشەکەی پشت گوێ خست ئەوانەی پێشتر بەشداریان لە شۆڕش کردبو و زۆربەی سەرکردەو لایەنگرانی دەگرتە خۆ . دیارە ئەم نازناوەی جوتیارەکان کرێکارەکانی پیشەسازیشی پشتگوێ خست ، سەرەرای ئەو کەمە بەشداریەی کرێکارەکانی پیشەسازی لە شکست پێهێنانەکەی باتیستا بەشداریان کردبوو ئەمانیش پشت گوێ خران ،جگە لەو بەشداریە دواتریش بە بەردەوامی هاوکاریی شەرەکانیان دەکرد ، کۆمۆنیستە کوبیەکان لە بونی شۆڕشێکی سەرکەوتوی بێ چینایەتی توشی ئالۆزی هاتن ، لەم بارەیەوە جوان مارتیللۆی کۆمۆنیست لە کانونی دوەمی 1959 دەنوسێ ودەڵێ :

شۆڕشی سەرکەوتو لە دەست کردی یەک حزب ویەک چین ویەک کۆمەڵ دا نیە بەڵکو گەل بە گشتی ئەم سەرکەوتنەی بەدەست هێناوە .

گیڤارا لەگەڵ ئەم رایە دابوو بە دیدی ئەو ئەم سەرکەوتنە بە هاوکاری هەموو کەسێک لە هەموو راو بۆچونی جیاو هەموو ئاین وچین وتوێژەکانی کۆمەڵ هاتوتە دی ،

ئەمەش موڵکی هەموو کەسێکە چونکە ئەم سەرکەوتنەیە ریزەکانی گەلی یەکخستوە ، گیڤارا هەلوەستەی لەسەر ئەوە کرد کە جوتیارەکان بە چینێکی سەربەخۆ بناسێ ، ئەوەتا چاکسازی کشتوکاڵی بۆ دەستەواژەی ململانێیی چینایەتی دەگەرێنێتەوە و کۆمەڵگای کوبیش بەسەر دوو بەشدا دابەش دەکا :

خاوەن زەویەکان کە بەشێکی زۆری چینی مامناوەندین و دواتر ترسیان لە لەدەست دانی زەویەکانیان هەبوو بۆیە یارمەتیان دان .

بەشەکەی تریش ئەو جوتیارانە بون کە لەلایەن کرێکارە شارستانەکانەوە یارمەتی دەدران .

ئەمە ئەو کاتە رویدا کاتێک سەرکردە کانی کوبی بەرەو مارکسی- لینینی وەرچەرخان و لە کاتی قۆناغی بەستنی پەیوەندیە خۆشەکان لەگەڵ حزبی کۆمۆنیستی کوبی و لە کاتی تێک چونی پەیوەندیەکان لەگەڵ ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دوای خۆماڵی کردنی کێلگەکانی ئەمریکیە باکوریەکان دێت ، ئەمەش دەبێتە مایەی بەستنی پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت بە مەبەستی سەپاندنی دەسەلاتیان بەسەر کەنارەکانی فلۆریدا ،

لەمەش زیاتر خەریک بوو کرێکارە شارستانەکان چاورونیان لە بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان لە شۆڕشی گوند بەدی بکەن .

بەڵام چینی مامناوەندی لەو ناکۆکیەی نێوان فیدل کاسترۆ و کۆنە سەرکردە دیموکراتخوازو ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بێزار ببون کە ماوەیەکی زۆری درێژە کێشابو .

گیڤارا رۆڵی هاندەرو چاودێریی لەو گۆرانکاریە دەبینی کە بەسەر سیاسەتی حکومەتدا هاتوە ، ئەم گۆڕانکاریەش بەتەواوەتی لەگەل ئەو گۆرانانە یەکیان گرتەوە کە بەسەر بیرکردنەوەکانی گیڤارا دا هاتبون ئەوانەی لە گواتیمالاوە دەستیان پێکردبوو و لە مەکسیک گەشەیان کردو لە ئەلسیرا مایسترا پێگەیشتبن .

شەڕی شۆڕشگێریی دژی باتیستا وستەمکارەکانی هانی گیڤارایان دابو تا رق وکینە لە دوژمنی سەرسەخت چڕتر بکا ، زۆردار خاوەنی روێکی تری جیاوازە ئەمە دیدی گیڤارابو ، بەڵام دوای سەرکەوتن هەر بە کەمێک پشت لەو راستیانە دەکا و هەر وەکو گواتیمالا ئیمپریالیی دەرەوە بە دوژمنی راستەقینە دەزانێ. ئیتر وا دەبینێ کە خولقاندنی پیشەسازی نەک پەرە پێدانی کشتوکاڵ تاقە چارەسەریە بۆ کێشەی ولاتە دواکەوتوەکان دژی هێزی ئابوریی ئیمپریالیزم ، تەنانەت ئەگەر دابەش کردنی زەویەکان بەسەر جوتیارەکاندا دادپەروەریش بێ .

ئەوەندەی نەبرد گۆران لە گوتارەکەی گیڤارا بەدی دەکرا ، کەمتر باسی لە جوتیارەکان دەکرد وزیاتر باسی لە کرێکارەکان دەکرد ، کەمتر باسی لە چاکسازی کشتوکالی دەکرد و زیاتر بایەخی بە باسکردن لە پیشەسازی دەدا .

لە ئۆکتۆبەری 1959 گیڤارا سەرۆکایەتی فەرمانگەی پیشەسازی بۆ دوبارە رێکخستنەوەی گرتە ئەستۆ ، دواتر پاش ئەوەی وەکو بەرێوەبەری بانکی نیشتمانی

دەست بە کار دەبێ دوای ماوەیەکی تر لە شوباتی 1961 پۆستی وەزیری پیشەسازیی پێ دەسپێردرێ ، ئەرکی سەرەکیی بریتی دەبێ لە گۆرینی بەرهەمی کشتوکاڵی وپاشماوەکانی بۆ بەرهەمی پیشەسازی . لەتەک ئەمەش ئەرکی سەرشانی بریتی دەبێ لە دۆزینەوەی بواری نوێ کە بتوانێ کوبا لە بەشە پێویستیەکانی خۆی وەبەرهەم بێنێ ، بەم شێوەیە ئەرکی دەبێتە بوژاندنەوەی بوارەکانی بەرهەم هێنان .
دواکەوتو کێیە ؟
دواکەتو کەسێکی کورتە باڵای سەرزل و سنگ دەرپەریو بە رادەیەک کە هەردوو لاقە لاواز وباسکە کورتەکانی لەگەڵ باقی جەستەی نایەنەوە .
لە پێناو تەواو کردنی ئابوریی ئیمپریالیزم هەڵساوە بە پەرە پێدانی ئەو بەرهەمە کشتوکاڵی وپیشەسازیانەی کە تەنها خۆی پێویستیی پێیانە بەهۆیەوە ولاتەکەمان گێر و لاسەنگ بوە بۆیە دەبینین کە دواکەوتو و لاسەنگی چەند تایبەت مەندێتیەکی ترسناک لە کەلو پەلەکانی خاو دروسە دەکەن ، هاتنە کای ئەم حالەتە مەترسیی برسێتیی هەموو گەلی لێ بەدی دەکرێ .
ئێمە لەو دواکەوتوانەین کە پشت بە هێنانی یەک جۆرە بەرهەم دەبەستین بە پشت بەستن بە یەک بازاری فرۆشتن وساخ کردنەوەی بەرهەمەکانمان ، ئەوە نیە یەک جۆرە بەرهەم ویەک بازاری فرۆشتنمان هەیە ؟ بەهۆی بەسەردا سەپاندنی چەندین مەرجی قورس هەردەم مەترسی نەفرۆشتنی بەرهەمەکانمان هەیە ، ئا ئەمەیە ئەو هاوکێشەی کە بەهۆیەوە ئیمپریالیزم دەست بەسەر ئابوریمانەوە دەگرێ ، ئەمە بە یەکگرتن دەکرێ لەگەڵ دەوڵەتی رۆمانیی کۆن و هەمیشە سودمەند ! ( لەیەکیان جیا کەرەوە بەسەریاندا زاڵ دەبی ) .
لە راستیدا بەستنەوەی ئابوریی کوبی بە بەشە هاوردەی شەکر کە کۆنگرێسی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بریاری لەسەر دابو سەلماندنی راکانی گیڤارا بون لەسەر ولاتە دواکەوتوەکان .
بە جەخت کردنی لەسەر پرسی کرێکارانی شار گیڤارا هەستی بەوە نەدەکرد کە لە جوتیارەکان دور دەکەوێتەوە ، جوتیارەکان بە پێدانی زەوی و چاکسازی کشتوکالی و دەستکەوتەکانی کۆمەڵایەتی و فێری خوێندن کردن ونەهێشتنی بێکاری وئامێری نوێ و هەمەجۆر کردنی بەرهەمەکان پاداشت دەکران . ئێستاش تەنها یەک چین هەیە کە بتوانێ کوبا رزگار بکا ئەویش چینی کرێکاری شارە ، نۆرەیان هاتوە ببن بە چینی پێشرەوی شۆڕش ،لە 1961 حوکمی پاشەکشە بەسەر چینی بورجوازیدا سەپاند .
بەهۆی ئەو فشارەی ئیمپریالیزم خستبویە سەر بەرژەوەندیەکانی بۆرجوازیەتی کوبی ، گیڤارا پێی وابو سۆز ودڵسۆزی چینی مامناوەندی لە کاتی شەری باتیستا بۆشۆڕش سنور دار بوو .
دەبوایە شەڕێکی نوێ دژی چینی مامناوەندی بەرپا بکرێ ، لێرە گیڤارا ئەو گرنگیە ئاشکرا دەکا کە ئەو 12 جەنگاوەرە هەیان بوو چۆن توانیان خۆیان لە مردن بپارێزن تا گشت دورگەکە یان رزگار کرد.

بەدروستی وایە چۆن بیزارو بەر لە شەڕی بیرۆ لەگەڵ 13 پیاوەکە بە زیندوێتی لە دورگەی جالومانەوە ، بیزارو لەسەر لم هێلێکی کێشا تەنها چەند پیاوێک لەسەری رۆیشتن ، ئەوانی تر بەرانبەر بە هێرشەکان خۆیان پێ نەگیراو پاشەکشەیان کرد ، لە کاتێکا پیاوەکانی بیزارو خۆراگرانە بەرگریان کرد تا ئەو کاتەی بیرۆ رزگار دەکەن ، ئەمەش بە تەواوەتی وەکو خۆراگری پیاوەکانی کاسترۆ لە کوبا وابو.
ئێستاش وەکو کۆمەڵێکی رزگارکار ئامادەن بۆئەوەی گیڤارا هێرشەکانی خۆی بۆسەر دوژمنە نوێکانی شۆڕشیان بۆ رون بکاتەوە .
جارێکی تر کوبا هێلی لەسەر لم کێشا و جارێکی تریش ئێمە چالەکانی بیزارو دەبینینەوە ، لە لایەک خۆشەویستانی گەل هەن لە لایەکەی تریش ئەوانەی رقیان لە گەلە هەن . لە نێوان ئەمان وئەواندا ئەو هێلە سەر هەڵدەدا کە هەردوو هێزە کۆمەلایەتیە مەزنەکە لە یەک جیا دەکاتەوە ئەوانیش چینی بۆرجوازەکان و چینی کرێکارەکانن . ئەم دوو چینیە لە میانەی بەرەو پێش چونی ئۆپەراسیۆنەکانی کوبیدا باشتر لەیەک جیا دەبنەوەو هەر یەکەی شوێنی خۆی لەم شۆڕشەدا بۆ دیاردەبێ، هەروەکو هەمو جارێک گیڤارا مێژوی خۆخەریک کردن بەپێشەسازیە نوێکانی دیار کرد کە لە ئەزمونەکانی ئەلسیرا مایستراوە دەست پێدەکا ، لەو کاتە گیڤارا دەڵێ: فیدل کاسترۆ وا باسی لەوە کرد کە چۆن جارێکیان کارگەیەکی بچوکی پێلاومان دروست کرد ، ئا لەو ساوە بوینە بەرهەم هێنەری پیشەسازی . ئێستا دروست کردنی کارگەیەکی پیشەسازی بۆتە بەشێک لە خەباتی شۆڕشگێران و ململانێی رزگاری جیهانی سێیەمی سەرتاسەری .
کارگەی کوبای مەزن لە هێزی سیاسییەوە بەدی دەکرا، ئەمەش وەکو بەرجەستەکردنی ولاتە دواکەوتوەکان ئەوانەی لە پێناو ئازادیدا لە یەک بۆدەقەدا خەباتیان دەکرد .
پەیوەندیی باشی لەگەڵ ئامرازەکانی شۆڕش بەستن . ئامانجی ئەو دەوڵەتانەی لە پێناو وەدەست هێنانی ئازادی دەجەنگین بەرهەم هێنانی کاڵای پیشەسازی بولە پێناو ئازادی ورزگاریدا . هەر بۆیە بۆ دەوڵەتانی دونیا خەباتی شۆڕشگێری تاقە دەروازە بوو بۆ پێشوە چونی پیشەسازی دژی خۆسەپاندنی ئیمپریالیزمی ئابوری .
ئاسایی بوو پێشوەچونی پیشەسازی هەندێک تایبەتمەندیی زەروری هەبوون ، چۆن شۆڕشگێرەکان بۆ سەرکەوتن مەرج وتایبەتمەندیان هەبون ئەوانیش بە هەمان شێوە .
بۆ ئەوەی کرێکاری کارگەیەک فێری دلسۆزی وهونەری بەرهەم هێنان بێ دەبێ هەمان گیانی خۆبەخت وفیداکاریی هەبێ وەکو جەنگاوەرە گوندنشینەکان . جوتیارەکان جەنگین وقۆناغی یەکەمی شۆڕشیان بردەوە، بۆیە پاداشتیان ئەو روبەرە زەویەبوو کە لەبەردەستیان دا بوکە لە کاتی سەرکەوتنی شۆڕش پێیان بەخشرا ، ئێستاش پێویستە کرێکارەکان لە قۆناغی دوەمی شۆڕشدا بە هەمان گیان بجەنگن ، جەنگی ئەوان خولقاندنی ژێرخانێکی پیشەسازیی ناوەخۆیە .

لـەو کاتـەی ئـەم پرۆسـەیە جێبـەجێ دەکـرێ لەسـەر کرێکارەکـان پێویسـتە دەسـت بـەرداری گـەلێک دەستکەوتی ئـابوریی خۆیـان بـن ، لەوانـە ئـەو بـەرز بونـەوەی کرێـی رۆژانـەیان کـە بوە مایـەی بـەرز بونـەوەی ئاستی بژێویـان ، نـابێ چاویـان لـە دەولـەتی داهاتو بێ کە کراوەیە بەڵکو دەبێ چاوی ئەوەیان لێبێ رەزیل ودەست داخراوە ، ئـەو کاتەی کرێکارەکان دەبینین ئاستی بژێویان بەرەو نزمی دەروا دەبێ ئـەوان بڕوایـان بـە دواڕۆژێکی گەش هەبێ بۆ خۆیـان ومنداڵـەکانیان کـە چاوەروانیـان دەکـا و شۆڕشـی پـی سـەردەکەوێ ، بـۆ ئـەوان وا باشـترە بـەم گۆرانکاریانـە دڵخـۆش بـن بـۆ ئـەوەی قوربانیەکانیان لەبەر چاو بمێنێ .
رەخنـەگرانی سیاسـەتەکانی گیڤارا ئـەم گۆرانـەیان بـە گـۆڕانێکی سەرتاسـەری زانـی ، چونکە ئەوکاتەی پێویستیی بـە پشتگیریی جوتیارەکـان بـوو داوای لـێ کـردن خۆیـان لـە پێناو چاکسازی کشتوکاڵیدا بەخت کەن .بەڵام کاتێک پێویستیی بە هاوکاری وپشتگیری کرێکارەکـان بـو لـە جوتیارەکـان زیـاتر داوای لێکـردن بـە نـاوی بوژانـەوەی پیشەسـازی خۆیـان بـەخت کـەن . لـە قۆنـاغی یەکـەم رق وکینـی مولکـدارەکانی زەویـی لـە نێـو شۆڕشگێر وجوتیارەکاندا بەستەوە، لـە قۆنـاغی دوەمیش بـۆ رازی کردنـی کرێکارەکـان هێرشـی کـردە سـەر بوجوازیـەت ، لـە هـەردوو حالـەت دا وا بـەدی دەکـرا کـە بیـردۆز وبرواکانی بۆ پاساو هێنانی سیاسەتەکانی حالی حازری بون .
بـۆ نمونـە ئـەو خۆشـبێژیە بـوو کـە لەگـەل حزبـی کۆمۆنیسـتی بـەکار دەهێنـا کاتێـک پێویستیی پێ بو بۆ پشتگیری کردن لە وەدەست هێنـانی هێـزی سـەندیکای کرێکـاران تـا بتوانێ لە نێوان کرێکارە شارنشینەکان ومانگرتواندا بێت وبچێ .
وا بـەدی دەکـرا کـە گیڤـارا هـیچ کارێـک ناکـا جگـە لـە بریقـە دان بـە چـەمک وستراتیژەکان نەبێ کە ئەمەش خەسلەتی هەر سیاسەت مەدارێکە .
لەگەڵ ئەوەشدا ئەزمون وشیکردنەوە ، نەخشە وجێ بەجێ کردن وەکو جمـک بەیەکـەوە بەسـتراون . لـە سـاڵەکانی بـەرایی حکومـەتی شۆڕشـگێر سـەرکەوتنی سیاسـیی گیڤـارا سەرکەوتنی سیاسیی کوبا دەبەخشی . کارتێکردن لە نێوان برواکانی گیڤارا وسیاسـەتی گشتی ، وەکو هاوسەرگیری بـو لەگـەڵ ئامانجـەکان، لێـرە دەتـوانین نەخشـەیەک بکێشین تیایدا گۆڕانکاریەکانی راو بۆچونی گیڤارای تایبەتی لەسەر ئامانجەکانی شۆڕش دیـاری بکەین .
بـەڵکو روداوەکـان گـەلێک کـەلێنیان لـەم گۆرانکاریانـە پـڕ کردبێتـەوە ، بـەڵام هـەر چۆنێکی بێ بیرو برواکانی گیڤارا لەم بوارە رۆڵـی خۆیان بینـی .
سـەرکەوتنی هـەر شۆڕشـێکی مـەزن، پێویسـتیی بـە سـەر هەڵدانی سیاسـەت و بیـرو بروایەکی لەیەک چویان هەیە کە بە سەرکەتویی پیادەیان کەن .

**پەرە سەندنی کاروانی شۆڕشی کوبی**

-----------------------------------------

| | دۆخی قۆناغی یەکەم | دۆخی دواتر |
|---|---|---|
| شوێنی ململانێ | ئەلسیرا مایسترا وناوچەی گوندەکان | هەموو کوبا وجەخت کردنە سەر شارەکان |
| سەرکردەکان | شۆڕشگێڕەکان وەکو هێزی سەربازی | شۆڕشگێڕەکان وەکو گەورەی هەڵوێست |
| هاوپەیمانەکان | جوتیارەکان وچاکسازە شارستانەکان وچینی مامناوەندی | کۆمۆنیستەکان وکرێکارە شارستانەکان وجوتیارەکان |
| دوژمنەکان | باتیستا وسوپای نیزامی ،بەرژەوەندیەکانی کوباو ئەمریکا | ئەمریکا وهێزە دورخراوەکانی کوبا وتازە پێگەیشتوەکان |
| چینی پێشڕەو | جوتیارەکان | پرۆلیتاریە شارستانەکان |
| بەراییەکان | دوبارە دابەشکردنەوەی زەوی و هەمە جۆر کردنی کشتوکاڵ | خۆماڵی کردنی پیشەسازی و پەرە پێدانی تەکنەلۆژیا وسود وەرگرتن لە داهاتەکان |
| بازرگانی ودبلۆماسیەت | ئەمریکای لاتین وئەمریکا وئەوروپای رۆژئاوا | روسیای سۆڤیەت وئەوروپای رۆژئاوا |
| بیرو بروا | دیموکراسی ومرۆڤایەتی لەسەر بنەمای ئازادی ونان بۆ هەموان ( فیدل کاسترۆ 1959 | من مارکسیست ولینینیستم و تا مردنیش هەر وا دەمێنمەوە (فیدل کاسترۆ 1961) |

## بەشی پێنجەم

### گیڤارا لە بانکی مەرکەزی

گیڤارا بە تیوری وپراکتیکی رقی لە سامان دەبوەوە . بە درێژایی ژیانی رەخنەی لە پول پەرستەکان دەگرت و سەرزەنشتی دەکردن .

به پێچەوانەی خەڵک بوو ئەو کاتە ئەو دڵخۆشە کە دەست بەرداری سامان وسەروەت دەبێ نەک کاتێک وەدەستی دێنێ .
ئەم وشکیەی تا ئەو ئاستە کاری تێکردبو بۆ سەردەمی کۆمۆنیزمی سەرەتایی گەراندبوەوە بۆیە بڕوای وابو پارەو پول شەڕێکە هەر دەبێ روبدا . بەقەدەر ئەوەی قەشەی کەلیساکانی سەدەی ناوەراست کە رقیان لە ریبا بوو ئەویش ئەوەندە رقی لە سامان کۆکردنەوە بو و لێی بێزار بو . هەر لە تەمەنی گەنجێتییەوە رقی لەو کەسانە بوە کە کاتەکانی خۆیان بۆ پەیدا کردنی سامان و سەروەت تەرخان دەکرد ، ئەم دیاردەیەی زۆر بە شانازیەوە دەیگێرایەوە ، ئەو کاتەی لە نامەی خوا حافیزیدا بۆ فیدل کاسترۆ دەنوسێ دەڵێ : ( هیچ سامان وسەروەتێکم بۆ هاوسەر ومنداڵەکانم جێ نەهێشتوە و پەشیمانیش نیم لێی ) لای زۆربەی خەڵك ئەم دان پیانانە شەرمەزارییە ، بەڵام لای گیڤارا شانازیە ، چەند کەس لە پیاوە سیاسیەکانی ئەمریکای لاتین کاتێک پۆستەکانیان جێ دەهێلن دەتوانن ئەم گوتەیە بڵێن ؟ چەند کەسیش لە و پیاوانەی لە دەزگا حکومیەکاندا کاریان کردوە خۆیان را گرتوە و ئەو کاتەی بەم شێوەیە کارەکانیان جێ هێشتوە دڵەراوکێ نایانگرێ ؟ کە بۆ هاوسەرو چوار مندالەکەی هیچ سامان و سەروەت جێ نەهێلێ؟
گیڤارا چاوتێبرینی لە تاکی مرۆڤ وبەڵکو دەزگاکانی نێونەتەوەییشی نەدەگرت . رقی لە سیستەمی قەرزی بێگانە بوو ، بەدیدی ئەم ئەو قەرزانە دەبوایە بە خۆرایی بن ، ئەم هەستەی نەبوە هۆکاری ئەوەی تەنها دوژمنداریێتی سەرمایەداری و چالاکیەکانی بکا ، بەڵکو بوە مایەی ئەوەی دژی گەلێک لە رەفتارە کانی هەندێک ولاتی بلۆکی سۆڤیەتی بوەستێ ، لەوانەش قەرزەکانی روسیا کە بە کوبای دابون ، زۆر لەو هەڵوێستە پەست دەبوو کاتێک دەیبینی لە زۆربەی کۆمەڵگاکان کرێکاران خۆیان نمایش دەکرد بۆ ئەو کەسەی زیاتریان پێ بدا .
هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نەبو چاوبرسێتی ببێتە هاندەری بەرهەمهێنان ، بۆیە لەگەڵ ئەوە دانەبو لە پێناو زیاد کردنی بەرهەم کرێی رۆژانەکان زیاد بکرێن ، ئەم هەنگاوانەی بە چارەسەری ئازاردار ناو دەبرد ، بیری لەوە دەکردەوە کە کرێی رۆژانە بە پێی پێویست بە کرێکارەکان بدرێ وردە وردە تا ئەو کاتەی پارەو پول بە یەکجارەکی نامێنێ .
داوا کاری لەسەر کالایەکی تایبەتی یا لەسەر پیشەیەک نابێ زیاتر بێ لە داواکاری لەسەر کالایەکی تر کە کەمتر لایەنگری جەماوەریی هەیە بەڵام لە بواری کۆمەڵایەتی دا زیاتر پێویستە.
لەو جیاوازیانەی سەرسور هێنەر ئەوەیە ئەم دوژمنەی پارەو پول بکرێتە بەڕێوەبەری بانکی مەرکەزی بەر لەوەی بیکەن بە وەزیری پیشەسازی .
بەڵام ژیریەکی سەیر لەم بژاردەیەدا هەبو ، بۆ نمونە کاتێک چاکسازێکی کۆمەڵایەتی بۆ مەبەستی دانانی سنورێک بۆ کاری لەش فرۆشی دەبێ بچێتە مەیخانە وتیاترۆکانی تایبەت بە بازرگانی کردن بە لەشفرۆشی نەک سەردانی ژنە ئابرودارەکان بکا .

بەهەمان شێوە ئەوەی بیەوێ شەڕی سیستەمی نەختی کۆن بکا دەبێ ببێتە بەڕێوەبەری بانکێکی نیشتمانی بەر لەوەی دەست بە جەنگەکە بکا ، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندیەک هەیە لە نێوان بایەخ پێدانی گیڤارا بە پیشەسازی لە کوبا لەگەڵ ئەو بڕیارانەی کە دەیدان .
بۆ ئەوەی پرۆژە پیشەسازیە نوێکان ببوژێنەوە دەبوایە قەرز و هاوکاریەکان وەدەست بێنێ ، بۆیە دەبوایە دەمامکی سەرمایەداری شەرانگیز بکاتە سەر بۆ ئەوەی چەرخی پیشەسازی لە وڵات لە جولە دابێ ، ماکیهت بەشداریی لەو ئومێدە کرد کاتێک ووتی چ جیاوازیەک هەیە لە نێوان بەڕێوەبردنی بانک وتالانکردنی ؟
بەر لەوەی گیڤارا ئەم پۆستە نوێیە بگرێتە دەست شارەزایی تەواوی لەسەر ئابوری پەیدا کرد بۆیە زۆر بە خێرا فێری بیردۆزی بانکەکان بوو .
گەڵێک وتاری لەسەر پارە پێدان نوسی ، ئەم وتارانەش سەرچاوەیان لە بیروبرواکانی مارکسیزم وهێگلیزم وەرگرتبو دیارە ئەمەش بۆ ئەوە بوە بۆچونی کۆمۆنیستە وشکە ئابوریزانەکان ی سەرمایەداری بە درۆ بخاتەوە ، ئەوانەی لەگەڵ سیستەمی نەختی جیهانی کاریان کردبو .
ڕەوشتەکانی گیڤارا بەتەواوەتی رەنگ دانەوەیان لە بیردۆزەکانی بەدی دەکران . بۆیە فێرکاریەکەی بوبە شتێکی رەوشتی ، هەرچەندە فێری شێوازی کارکردنی بانکەکان ببو بەڵام مەبەستی ئەوە بو پارە پێدان بکاتە چەکێک لە خزمەتی ئایدیۆلۆژیادا بەکاری بێنێ . بۆئەوە بو بیرو بڕواکان سەقامگیر بن دەبێ شێوازی کار کردن سەرکەوتو بێ و هۆکاری هەڵبژاردنی شێوەی کارکردنیش هۆکارێکی ئابوری نیە بەڵکو رەوشتیە .
دیدی گیڤارا بۆ مرۆڤی سۆشیالیست هیچ ناکۆکیەکی نەبو لەگەڵ بیرکردنەوەی لەسەر شۆڕش و شەڕی ئابوری .
خەباتی دەکرد لە پێناو خولقاندی ئەو مرۆڤە نوێیە و زاڵ بون بەسەر چەوسانەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە . بەدیدی گیڤارا دەبێ هەموو شتێک تەنانەت ئابوریش لە لەدایک بونی ئەم نمونەیە بەشداری بکا ، ئا لێرە رەسەنایەتی گیڤارا دەسەلمێندرێ .
بە بڕوای گیڤارا حکومەتی سۆشیالیزمی شۆڕشگێڕ گەڵێک رێگەی بۆ بیرکردنەوە فەراهام کردوە کە بە پێچەوانەی ئامانجەکانی شۆڕشن ، بۆیە دەبێ هەرچی زوە ئەم رێگایانە لەناو بەرێن ، ئەگینا گیانی هەڤاڵبەندی وڕادیکالیزمی نوێ بۆگەن دەبێ .
ئەوەندە بەس نیە کاتێک رژێمێکی کۆن دەگۆڕدرێ ودەوڵەتێکی نوێ دادەمەزرێ مرۆڤ تیایدا دڵخۆش وپیشەسازیەکان خۆماڵی دەکرێن و بەرهەمەکان بە دادپەروەری دابەش دەکرێن .
مارکسیزم و نەخشەکێشانی مەرکەزیی لەوە زیاترە ئیدارەی دەوڵەتێکی دادپەروەر بەڕێوە ببا ، ئەگەر رژێمی نوێ ئەو پەیوەندیەی نێوان مرۆڤ خۆیان وکۆمەڵ نەگۆڕێ وئەگەر قوربانی وشەهیدەکانی شۆڕش وزیان لێ کەوتوان قەرەبو نەکاتەوە ، ئەوا بە دڵنیایی شۆڕشێکی تر هەڵدەگیرسێ چونکە خەمی شۆڕشە نوێکە تەنها گۆڕینی شێوازە کۆنەکە بوە .

ئەگەر سۆشیالیزم مەبەست و بایەخی بۆ بەرزکردنەوەی بژێوی زۆرینەی خەلک بو ئەوا دەبێ چۆنایەتی ژیان باش بکا ، دەبێ لە تەک پێدانی پارەو پول ماناکانی ژیانیش بەرەو پێش بەرێ و ئەم بەرەو پێش چونەش لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا بێتەوە .
لەسەر سۆشیالیزمە دوارۆژێک مسۆگەر بکا کە تیادا کارکردن بە چاوێکی ریزو پڕ ئابرو سەیر بکرێت و بە ئەرکێکی کۆمەڵایەتی بێتە ئەژمار و ببێتە مایە و سەرچاوەی دڵخۆشی مرۆڤ . ئەگینا ماندوو بونی مرۆڤ وەکو کالا سەیر دەکرێ و بۆ کرین وفرۆشتن نمایش دەکرێ ، ئەو کات مرۆڤ ناتوانێ بە چاوێکی رازی وشانازیەوە سەیری کارەکەی بکا ، چونکە (ئەرکێکی نەخواستراو و شەڕێک بو هەرگیز لێی دەر نەدەچوی ) ئەمەش نەخۆشیەکی سەرمایەداری بوو .
بەهۆی ئەوەی ئەوکات مرۆڤ لەو شانازیە بێبەش کرابو کە بە کارەکەی خۆیەوەی دەکرد دەبوایە زۆرینەی خەڵک لێت رازی بن ، سەرمایەدار شەرەفی مرۆڤی لەکەدار کرد ،کاتی خۆی مورۆڤ شانازیی بە کارەکەی خۆیەوە دەکرد ئێستا مرۆڤ نرخ وبەهای خۆی لە بەرهەمی کارەکەیەوە دەبینی و بو بە کەسێک گاڵتە بە خۆی بکا وتەنها لە پێناو پارە کار بکا نەک لە پێنا وخۆیدا . گۆڕینی هەستی کرێکار بەرامبەر بەکار وقازانجەکەی بەندە بە ئاراستە کردنی ئابوری وکۆمەلگا ومرۆڤ بەرەو سۆشیالیزمێکی دروست .
گیڤارا لەوە دڵنیا بو کە دەبێ چارەسەری ئەمە لە قۆناغی جۆشدانی یەکەمی هەڵکشانی شۆڕشدا بکرێ ، لێرە ( گیڤارا ) لەگەڵ کۆمۆنیستەکان توشی روبەرو بونەوە هات ، لایەنگرانی مەدرەسەی کۆن ئەوانەی مەبەستیان بوو یەکەم جار ئابوریەکی سۆسیالیزم دابمەزرێنن ، تەنانەت ئەگەر سەریشکەوت ئەوا ئەقلیەتێکی سۆشیالیزمیی دروست لە نێو کرێکارەکان بەدی دەکرێ ، بەڵام ( گیڤارا ) بەم گوتەیە رازی نەبوو ، چونکە دوای پەنجا ساڵ لە هێنانەدیی سۆشیالیزم لە یەکیەتی سۆڤیەت دەبینین هێشتا گەلێک پاداشتە سەرمایەداریەکان و جۆری بیرکردنەوەکان لە ریزی کرێکار و بەرێوەبەرەکاندا ماون ، بۆیە بەر لە ئەنجام دانی ئەم پرۆسانە دەبێ شۆڕشی رۆشەنبیری بەرپا ببێ ، پاداشت دەبێ لە پای بەرهەم هێنان بێ .
( ئێمە جەخت لە ژیاندنەوەی ویژدان دەکەینەوە کە لە ماوەیەکی کورتدا بەرهەم زیاد دەکا و پاداشت بۆ هاندان رۆلی لاواز دەبێ) ، بوژاندنەوەی ویژدان ئەوە دەگەیەنێ کە هانی کرێکارەکان تا بە هەموو تواناکانیانەوە بەبێ ترس کار بکەن ئەم کارکردنەش بۆ دابین کردنی دوارۆژێکی ئاسودە بۆ کۆمەلگاکەیان ولە بەرژەوەندی هەموو لایەک دا بێ ، ئەگەر دەوڵەت بەرژەوەندیە کانیانی پاراست ئەوا ئەوانیش دەتوانن لە بەرژەوەندیی گشت کاربکەن بێ ئەوەی مەبستیان وەدەست هێنانی پارەو پول بێ .
بیردۆزی ( گیڤارا ) لەسەر بەها ، بنەمای چاوپێکەوتنەکانی فیدل کاسترۆ بوون و پشتگیریی لێ دەکرد . بەها بە پێی نمایش و داخوازی دیاری ناکرێ ، بەڵکو بەپێی بەهاو گرنگی کالاکە یا خزمەت گوزاری لە روی رەوشت و کۆمەڵایەتی یەوە دیاری دەکرێ ، نەک بەپێی بەهای لە بازار، بۆیە بەهای کار لە روی مرۆڤایەتیەوە گەلێک

زیاتره لە بەهاکانی بە دەربرینی چالاکیە ئابوریەکانی ، دەبێ بانکەکانی دەوڵەت بودجەی پرۆژەکانی بازرگانی بەپێی بەها کۆمەلایەتیەکان بریار لەسەر بدا . نەک قەرز بەو کۆمپانیا خوێن مژانە بدرێ کە بەرێوە بەرەکانیان تەنها خەمی خۆیانەو بەس . ئەمەش وەکو ئەوەی کە ئێستا لە روسیا هەیە .

( گیڤارا ) بە مانا کۆنەکەی رەوشتیەوە بیری لە بەها کردەوە نەک بە دیاری کردنە تەسکەکەی ئابوری ، چونکە پیاوی ئابوری زان ئەو کەسەیە کە رژێمی سەرمایەداری دروستی کردوە ، مرۆڤ لە خۆیدا ئەو بونەوەرە کۆمەلایەتی و سیاسیەیە کە فەیلەسوفە گریکەکانی کۆن پێناسەیان بۆ کردوە ، بۆیە دەبێ رژێمی ئابوری خزمەتی بەها مرۆڤایەتیەکان بکا ئەمەش لە رێگەی خزمەت کردنی ئەو کۆمەلگایەوە دەکرێ کە مرۆڤ بۆی دەگەرێتەوە بەم پێوەرە سامان ئەوە نایەنێ کە کەلێنێک لە ژیانی مرۆڤ بگرێ .

ئەم بیردۆزە تۆباویە لەسەر بەها ، بەسەر بریارەکانی ( گیڤارا ) وەکو بەرێوەبەرێکی بانکی نیشتمانی دا زاڵ بو. پێی وابو کارێکی رەوا نیە کێبەرکێ لە نێوان کارگەیەکی حکومی کە بیرە وەبەرهەم دێنێ لەگەل کارگەیەک کە پەرتوک وەبەرهەم دێنێ بکرێ ، پەرە پێدانی کارگەیەک کە بیرە وەبەرهەم دێنێ بەمەبەستی زیاتر قازانج لێکردن لە روی کۆمەڵایەتیەوە کارێکی رەواو حەزلێکراو نیە . واتە تەرخان کردنی سامانێکی کەمتر بۆ بەرهەمهێنانی پەرتوکی خوێندنگاکان ، ئەمەش ئەرکی بانکی نیشتمانی بوو کە رێژەی بەها بۆ هەردوو مادەکە لای کۆمەڵگای کوبی دیاری بکا و بۆ هەر یەک لەم دوو کارگەیە بەپێی بەهاکانی کۆمەلایەتی رێژە دیاری بکا ، دور لە و قازانجەی لەم رێگەیەوە بە دەوڵەت دەگا .

بۆ ئەوەی هیچ فشارێک لەسەر دەوڵەت دروست نەبێ دەبوایە قەرزەکان بەبێ سود ( زیادە) بە خەلکی بدرێن ، چونکە دورنیە ئەگەر زیادەی بخرابایەتە سەر ئامانجی قەرزەکە گەندەل دەبوو ، بە هەمان شێوە نەدەبوایە قازانجی بەرهەمی کارگەکان بەشی کرێکارەکانی لێ بدرابایە چونکە ئەوکات چینێکی کرێکاری خاوەن ئیمتیاز دروست دەبوو لەئەنجام کۆمەڵێک کرێکار داهاتی بژێویان بەجۆرێک بەرز دەبوەوە لەو کرێکارانە زیاتر کە بەهانای کۆمەلگا کەیانەوە هاتون و ئێستا لە کارگەیەک کار دەکەن کە قازانجی بەقەدەر ئەوان نیە . پاداشتی کار دەبێ لە بەرژەوەندی هەموان دا بێ ، کاری بانکەکانە سنورێک بۆ پاداشت وکێبەرکێیە نارەواکان دا بنێ و دەبێ فێری بریاری خۆیانیان بکا کە بەهای دروستە ، هەڤالێتیش دەبێ لە خزمەتی شۆرشدا دەبێ .

ئەم بیرو بروایانە بونە هۆکاری ئەوەی ( گیڤارا ) بیر لە بژاردەی سەخت بکاتەوە بۆ پرسی نەخشە مەرکەزیەکان ، دیارە کە نەخشە کێشانە ناوەخۆییەکان بونە هۆکاری ئەوەی زیاتر هەست بە پێویستی بەشداریکردن بکا . لە هەمان کاتدا هاندرا بۆ زیاتر ئەنجامدانی کێبەرکێ لە نێوان ناوچەکاندا ، نەخشە کێشانە مەرکەزیەکان بەرەو بەرژەوەندیی دورگەکە هەنگاویان دەنا هەروەها سودی بۆ چاکتر کردنی بەرهەمەکان هەبوو .

لەیەکێک لە گوتارەکانیدا کە بۆ بەرگری کردن لە ئاراستەکانی مەرکەزیی تەرخان کردبوو ( گیڤارا ) بەم شێوەیە باس لە کێبەرکێکانی سەرمایەداری دەکا و دەڵێ : ( کێبەرکێی نێوان ئاژەڵەکانە ) ، هەروەها کاتێک باس لە کێبەرکێکانی سۆشیالیزم دەکا کە لە پێناو هەرچی زیاتر قازان کردنە دەڵێ : ( کێ بەرکێی نێوان ئاژەڵە زیندانیەکانە . )

هەوڵی بۆ دابین کردنی پێداویستیە گیانیەکانی مرۆڤ دەدا ، بەلام پێداویستیە جەستەییە کانیان نمایشی بون ، تەنانەت بۆپرسی کۆمەلایەتیش وەکو کاری خۆبەخشی مەبەستی بوو تەنها وەکو کارێکی ئاسایی وابێ چونکە کاری خۆبەخشی تەنها هۆکارێک نیە بۆ زیاد کردنی بەرهەمهێنان و بەس بەڵکو سەرچاوەی رۆشەنبیریی سۆشیالیزمیە بۆ جەماوەر .

بۆیە ( گیڤارا ) وئەوانەی لەسەر مەزهەبەکەی ئەو بون لە ئابوری ناسەکان مەبەستیان بوو نەخشەسازیەکی ئابوری دابمەزرێنن کە قازانجەکان بۆ خەزینەی دەوڵەت بچێ بۆئەوەی ئەویش بە دەوری خۆی بەسەر کۆمەڵگادا دابەش بکا و دەبێ کشتوکالیش بەهەمان شێوەی پیشەسازی بەرێوە بچێ و کێلگە حکومیە مەزنەکان دەبێ کار بە کرێکارەکان بکەن وموچەیان بۆ دابین بکەن و قازانجەکانیش بۆ هەموو لایەک وەکو یەک بێ . ئەمەو دەبێ زۆر بایەخ بە پیشەسازی بدرێ بە شێوەیەک کە ئامانج لە بایەخدانەکە رزگار کردنی کوبا بێ لە بازاری ولاتە سەرمایەدارەکان ، کەرەستەی خاو بە ئەرزانی بە ولاتان بدرێ تا ئەوانیش بەرهەمەکانیان بە هەرزان بە کوبا بفرۆشن و ئێمەش کەرەستە بەرهەمهێنەرەکان بە نرخێکی بەرز لە بازارەکان بفرۆشین ، دیارە کە دروست کردن تاقە دەرمانە بۆ چارەسەری هەموو نەخۆشیەکانی دابەزینی باری ژیانی خەلک کە هەموو دەوڵەتە هەژارەکان توشی هاتون و پێیەوە دەناڵێنن.

ئەمەو چاکسازیی کشتوکالیش گەلێک گرنگە بۆئەوەی چیتر پشت بە یەک جۆرە بەرهەم نە بەسترێت و بەرنامەی فرە بەرهەمی پیادە بکرێ وبۆ پێداویستیەکانی خۆمالیش بەشی خۆمان بەرهەم بێنن ، تەنانەت ئەگەر ئەم کەم کردنەوەی بەرهەمە کار بکاتە سەر زیاد بونی سەرمایەی بێگانەش دەبێ ئەم هەنگاوە بنرێ چونکە سەربەخۆیی ئابوری یەکێکە لە بنەماکانی سەربەخۆیی سیاسی .

تاقە هاندەر لە دوای ئەم نەخشەو بەرنامانە تەنها وشیاری شۆرشگێرانەیە ، بنیاد نانی سۆشیالیزم تەنها بەکارکردن ناکرێ . بەڵکو کار و وشیاری و پەرە پێدانی کالای مادی لە میانەی دروست کردنی وشیاری وپەرە پێدانی دەبێ . دەبێ بایەخ دان بە پەرە پێدانی وشیاری لەسەروی بایەخ دان بە پەرەپێدانی بەرهەمهێناندا بێ .

بۆ نمونە هەرچەندە کێبەرکێ کارێکی خەراپ و نا رەوایە ، ئەو کاتەی هانی کێبەرکێ درا چ لە ولاتانی سەرمایە دار یا ولاتانی سۆشیالیزم کارێکی بەسود بوو ، چونکە هانی هەڤالە دلسۆزەکان درا بۆ کاری باش ، ئەو کات کێبەرکێ چەکێکی دوو سەرە بوو ( کێ بەرکێ وەکو یاریی تۆپانێ نیە ، ئەو تیپەی دەدۆرێنێ پرتەقال لە ناوبژیوان بگرێ ، دەبێ کێبەرکێکە بە خۆشیەوە بەرێ بکرێ ، بەلام بۆ ؟ بۆ ئەوەی

هەموو کەسێک لەم روەوە بەرهەم زیاد بکا ، نەک تەنها ئەوەندە ، بەلکو بۆ پەرە پێدانی وشیاری جەماوەریشە ، چونکە بەراستی ئەمە کێبەرکێی وشیاریە ، ئەوەی بۆ وشیاری دەبێ بۆ مەیدانی جێبەجێ کردنیش دەشێ ، نابێ وەکو دونیای سەرمایەداری تەنها لە رێگەی کارەوە چالاکیە کانمان زیاد کەین ، بەلکو دەبێ وشیاریش بەشێکی زۆری لەم پەرە پێدانەی بەرکەوێ ، پوختەکەی ئەوەیە کە ئامانج دروست کردنی مرۆڤێکی نوێ بێ کە ئەمەش لە ئامانجە کۆمەلایەتیە هەرە پر بەهاکانە ).
ئەوەی جێی سەرسامیە لە ئەزمونی کوبا ، ئەوەیە کە ئامانجەکانی ( گیڤارا ) خرانە بەردەست بۆ جێبەجێکردن ، هەرچیەکی دوژمنان دەیلێن دەبێ ئەوە بزانن کە کاری خۆبەخشی لای جەماوەر کە بەرنامەی ( گیڤارا ) بوو جێ بەجێ دەکرێ وبەردەوامیی هەیە جا ئەم کارە خۆبەخشیە ئەگەر بە هەمان روحیەت وئاراستەکانی دارێژراو لەلایەن ( گیڤارا ) وە نەبێ و بەهەمان هۆکاریش نەبێ ، گرنگ ئەوەیە بونی هەیە ، چونکە ئەوانیش هاوشێوەی هەڤالانیان ئەگەر لەترسی رەخنەکانیشیان بێ بەلام ئەم پرۆسەیە لە هەموولایەک بەردەوامیی هەیە . چونکە لە کوبا ئەگەر لە کاتە بێ ئیشەکان ئەم کارە نەکەن هیچ کارێکی تر نیە خۆیان پێیەوە خەریککەن .
بەلام دەبێ ئەوەش بزانین کە وشیاری شۆرشگێریش لەم روەوە رۆڵی خۆی دەبینێ ،دەبینین کاتێک هاولاتیان هاڤانا جێ دەهێلن و بۆ چنینی چەوەندەر رو لە کێلگەکان دەکەن ئەوان هەست دەکەن کە ئەرکێک لە ئەرکەکانی شۆرش بەجێ دەگەیەنن بەلام ئەگەر بە هێواشی ئەم کارە بکەن و هیچ بەرهەمێکیان بەهۆیەوە دەست نەکەوێ ئەوا بەم کارەیان دەیسەلمێنن کە بۆچونەکانی ( گیڤارا ) راست بون .
بۆیە لە تواناداهەیە وشیاریی تەواو بە هاولاتیە ئاساییەکان بدرێ بۆ ئەوەی مانایەکی باش بە کارەکانیان ببەخشن ، کاتێک کرێکارێک کار دەکاو بەرهەمی ئەو کارەی بەشی بژێویی ناکا بەلام ئەو کەسە شتێک بنیاد دەنێ و هەست بەوە دەکا کە خۆی خاوەنیەتی ، بەم کارەی هەنگاوێک بەرەو بۆچونەکانی ( گیڤارا ) ناوە .
سەرەرای ئەوەی ( گیڤارا ) جەختی لە جێبەجێ کردنی بەرنامەکانی دەکردەوە بەلام ئەوەندە توند و ووشک نەبوو ، لە مامەڵە کردندا بۆ جێ بەجێکردنی بەرنامەکانی کرچ وکاڵ نەبوو . مەبەستی دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێز نەبوو بەڵکو مەبەستی دروست کردنی گەلێکی سۆشیالیست و دڵخۆش بوو. بەراستی رەخنەی لەو کەسانە دەگرت کە خاوەنی هزرو بیرێکی وشک وچەقبەستوو بوون ( کاری بنیادنانی کۆمەڵگایەکی سۆشیالیست لە کوبا دەبێ دور بێ لە بیرکردنەوەی میکانیکی ، ئەمە وەکو نەخۆشی تاعون وایە دەبێ لێێ دور کەویتەوە چونکە بیرکردنەوە میکانیکیەکان تەنها بەرەو زۆربێژی دەمان با هیچ گۆرانێکمان پێ نابەخشێ ، مارکسیزم بیرکردنەوەیەکی دیالکتیکانەیە بەرەو گۆران دەمان با ، لەهەمان کاتدا بیرکردنەوە وشکەکانی ناو مارکسیزم بەهۆی ئەوەی ئەزمونی ( گیڤارا ) رەت دەکەنەوە ئەویش نەخۆشیە . بە دیدی ( گیڤارا ) شۆرشگێر بونەوەرێکە و مرۆڤە ، دەستەواژەی ( دەبێ مرۆڤ بێ ) مانای ئەوە نیە دەبێ مرۆڤێکی لاواز بێ یا رەفتارەکانی وەکو مرۆڤەکانی

تـر نـەبن ، واتـە دەبـێ هـەموو تواناکـانی بخاتـە گـەر نـەک هەنـدێک لـە تواناکـانی ، هەرچۆنێکی بێ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤ دەبێ هەولی پەرە پێدانی توانـا و هزرو هۆشەکانی بدا ، دەبێ بە کوشتنی هەر مرۆڤێک لە هەرکوێیەک بێ بە ئازار بێ و تـا لـە تواناییدا بێ هەرتەگەرەیەک لە رێگەی ئازادی و رزگاری لـە هەرکوێیـەکی دونیـا هـەبێ بتوانێ لاییەرێ ، ئەگەر کەسێکی تر ئەم تەگەرەی لابرد دەبێ ئەو پێی خۆشحال بێ .

( گیڤـارا ) وا دەبینـێ کـە هـەردوو وشـەی ( مرۆڤایـەتی ) و ( شۆڕشـگێر) جمکـن تـا بیرکردنەوە لە ژیانیدا مابێ .

گومان لـەوە دانیـە کـە لـە نێو بیرکردنـەوەکانی ئـابوریی ( گیڤـارا ) دا هەندێک لەیـەک نەچون هەن ( پەیوەندیی بە ئاژاوەگێری وتۆباوی و کۆمۆنیزم ی سەرەتایی هەیە کـە بـە تەلـە داوێـک لەیـەک بەستراونەتەوە ، دیـارە لـە پشـت هـەموو جـەخت کردنەوەکانیـدا بەرنامەیـەکی مەرکـەزی هەیـە) لـە یـەکێک لـە کۆبونـەوەکانی جەماوەریـدا کـە گـەلێک کرێکـاری لـەناودا دەبـێ ( گیڤـارا ) گوتارەکـەی بـە وتـەی شـاعیرێک دەسـت پـێ دەکـا ئاماژە بـە نـەزانی خـەڵک دەدا چونکـە کەسـیان نـەیان توانیـوە ( لـە لێدانی رۆژ بگـەن ) هـەروەها ( نـەیان توانیـوە گولـە گـەنمێک بـە خۆشـی بدورنـەوە ) ، دواتـر باسـی لـە هەوڵی کوبیەکان کرد کە چۆن بە توانـای خۆیـان توانیـان ئـەم کوبایـە لـە رێگـەی حـەزی خۆیانـەوە بگـۆڕن و بـەرەو سروشـت و لـە سیسـتەمی رۆژانـەی تەمبەلیـەوە بـۆ رۆژانەیەکی پڕ چالاک و ئامانج بەرن ) ، ئەگەر ئەو شاعیرە بگەڕێتـەوە کوبـا بـەچاوی خۆی دەبینێ کە چۆن ئەو خەڵکە لەو سەردەمی قات و قڕیەی سەرمایەداری رزگاریـان بوە پاش ئەوەی ئەو خەلکە وەکو ئاژەل گاڵتەی پێدەکراو ماندو بونەکەشی دەچوە باخـەڵ چەوسێنەرانەوە . ئـەوەتا ئـەم گەلـە دوبـارە رێگـەی راسـتی گرتـەوە بـەر بـۆ ئـەوەی جارێکی تر مانایەکی راستەقینە بە کار ببەخشێ کە رۆژانە بە دڵخۆشیەوە خـەڵکی بۆی دەچن .

( گیڤـارا ) ئامـاژە بـەو نـازو خۆشـیە دەدا کـە ئـەو کاتـەی کرێکارەکـان بـە خۆشـیەوە چەوەندەریان دەچنی ، واتە کێشە و کۆیلایەتیە کـە لـە نـەبونی کـاردا نیـە بـەڵکو کێشـە لـە مولکدارێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دایە ، ئەوەتا دوبارە کرێکارەکان ئەو خۆشیەیان بۆ گەرایەوە کـە لـە نێو خۆیاندا لـە کارگـەکان هـەیانبوو، جـارێکی تـر هەسـت بـە بـونی خۆیان لە ناو هۆکارەکانی بەرهەمهێنان دەکەن .

بـەم دۆخـە دلخۆش بـوو وا هەستی دەکـرد کـە وەکـو هـەرچوار وەرزەکـە لـە گۆڕان و جولانەوە دایە و سود و بەرهەم بـەو خەڵکـە دەبەخشـێ ، دیـارە کـە وەرز سود وبایـەخی خۆی هەیە بەلام مـرۆڤ بەهـەمان شێوە هاندەری تری هەیـە کـە بـەرەو بەرهـەم هێنـان پاڵی پێوە دەنێ ئەویش هەست کردن و وشیاریەکەیەتی ، هەوڵ و تێکۆشانەکانی مـرۆڤ بـۆ بـەرەو پـێش بردنـی پێشـەکیەکانی بنیادنـانی سۆشـیالیزمە ، واتـە دۆزینـەوەی کـاڵای زیاتر بۆ پێداویستیەکانی رۆژانەی گەل بە گشتی یە.

لـە کـارە سـەیرو سـەمەرەکان ئەوەیـە کـە ( گیڤـارا ) بـەم گوتانـەی دەری خست کـە رەوشتەکانی زۆر لـە رەوشتی( بیوریتـانیو)ی رەسـەن نزیکـە کـە دینـەمۆی خولانـەوەی ئابوریی ئەمریکای باکوری بوو .
بیوریتانیو بەبەردەوامی ئـەوەی دەسـەلماند کـە کـار ئـەرکێکی کۆمەڵایەتیـەو دەبـێ بـە خۆشیەوە ئەنجام بدرێ .
یاسـاکانی کۆمـەلگای ( گیڤـارا ) یاسـای کۆمـەلگای سـەدەی حەڤدەهـەم نـەبون ، بـەلام شێوازی رازی کردن بۆ کار لە مەیدانە گەمژەکاندا هەمان شێواز بوون .
( گیڤارا ) فەلسەفەی ئابوریی بە گوتارە بەناوبانگەکـەی بـەناوی ( مرۆڤ وسۆشیالیزم لـە کوبـا ) شـی کـردەوە ، ئـەوەی رەت کـردەوە گوایـە دەوڵـەتی کـوبی بـۆ ئـەوە هـاتوە تـا تـاکی مـرۆڤ لـەناو بـەرێ . بـەڵکو بـۆ ئـەوە هـاتوە تـا مرۆڤێکـی نـوێ بخـولقێنێ ئـەو مرۆڤـەی کـە سـیماکانی لـە کـاتی شـەڕە قارەمانێتیـەکانی ئەلسـیرا مایسـترا دەرکـەوت ، هەروەها لە میانەی هاری کان فلۆرا و لەو رۆژانەی کە گەل بە تەواوەتی خۆی بـەخت کرد تا لە کاتی قەیرانی رۆکێتەکان خزمەت بـە گـەل و نەتـەوە بکـات . کێشـە لـەوە دابوو هەستی هاوکاری کردن تەنها لە کاتی قەیرانەکان و کارەساتە کانـدا بـەدی دەکـرا ، ئــەم هەســت کردنــە بــوو بــە پردێکــی بــەردەوامی پەیوەندیــەکانی نێــوان گــەل و سەرکردەکانی .
( هـەموو دەست پێشـخەریەکان لـە لایـەن کاسـترۆ یـا سـەرکردەکانی شـۆڕش دەهـاتن ، دواتر ئەم دەست پێشخەریانە بۆ گەل رون و شی دەکرانەوە وەکو ئـەوەی هـی خـۆی بـن ، هەندێک جاریش لە شەڕەکان پشتی بە ئەزمونە ناوەخۆییەکان دەبەست و بە بەشداری پێکردنی حکومەتیش گشتگیر دەبوو ، بەڵام ئەم پەیوەندیانە لە ئاستی پێویستدا نـەبون ، هەنـدێک جـار هۆکـاری سـەرنەکەوتنەکە بـۆ ئـەم ئەگـەرە دەگەڕێندرێتـەوە ، بـەڵام روەو باشـی رۆیشـت ، گومـان لـەوە دانیـە ئـەم سیستەمە حکومـەت بـۆ ئـەوە هێنایـە کـا تـا تـاک ملکــەچی حکومــەت بکــا . بــەڵام بــە دیــدی ( گیڤــارا ) تــاکڕەویی رۆژئــاوایی سەرمایەداریە ، ئەوەتا رۆکفلەر باشترین نمونەیە لەسەر تاکڕەوی رۆژئاوایی .
بەڕاستی ئـەم گەلـە سـەربە گورگەوەیـە ئـەوەی بگاتـە لوتکـە دیـارە لەسـەر حسـابی خەڵکانی تربوە ، مرۆڤ لە ژێر سـایەی سۆشـیالیزم مرۆڤێکـی بـێ دەسـەلات نیـە بـەڵکو کاڵایەکی ناتەواوە بۆیە لەسەر سیستەمی سۆشـیالیزمە ئـەم مرۆڤـە لـە کـەم و کوریـەکان پـاک کاتـەوە ، دەبـێ ئەوسـا مـرۆڤیش دوبـارە پـەروەردەی خـۆی بکاتـەوە ، دەبـێ ئـەم بیرکردنەوەو دوو دەستەواژەی سەرمایەداریی کوشندە لە مێشـکی خـۆی وەدەر نـێ و لـە بیـر خـۆی بباتـەوە کـە دەلـێ تـاکی مـرۆڤ پـەراوێزە و پەیوەندیـەکانیش پابەنـدی یاسـای نمایش و داخوازین .
گەلێک ولاتی دواکەوتوو هەن خۆیان رزگار کردوە و ئازادیان وەدەست هێنـاوە بـەڵام تا ئێستاش لە دەست بیرکردنەوەکانی سـەرمایەداری رزگاریـان نـەبوە ، ئەگـەر بمانـەوێ مرۆڤێکی نوێ بنیاد بنێین دەبـێ خۆمـان بـە وشـیاریی شۆڕشـگێرانە دەوڵەمەنـد کـەین کـە وەکو بەردی بناغەی بنیادنانی نەتەوەی نوێیە .

بۆیـە کۆمـەڵگای شۆڕشـگێڕی نـوێ دەبـێ وەکـو خوێندنگایـەکی مـەزن وابـێ چونکـە بەدوری نـازانین سـەرمایەدار بۆ لـەناو بردنیـان روو لـە بـەکار هێنـانی هێز بکـا ، بـەڵێ سـەرمایەدار بـەم شـێوە گـەلی فێر کـردوە ، بۆیـە لەسـەر حکومـەتی کوبیـە گـەل فێری بیری تایبـەتی بکـا ، زۆر بـەوردیش بۆئـەوەی نەکەونـە تەلـەی سـەرمایەداریەوە . تـەنها بـەم شـێوەیە مرۆڤـی نـوێ دێتـە بنیـاد ، ئـەم شـێوە مرۆڤـە هێشـتا تـەواو نەبونـەو وا بـە ئاسـانیش تـەواو نـابن چونکـە هاوتـەریب لەگـەڵ ئـابوری بـەرەو پـێش دەچـن ، ئـەوان هاوشان لەگەڵ جەماوەر و لە دوای سەرکردەکانیان بەرەو ئامانجـەکانیان هەنگاو دەنێن .

پشتگیریی لـە دام ودەزگاکـان کـرد و قوربـانیی پێشـکەش کـردن چونکـە ئـەوە قۆنـاغی پەرینەوە بەرەو دونیایەکی نوێ بوو.

ئامانجی سەرەکیی شۆڕش گەڕاندنەوەی ئازادی خوازەکان بو لـە غوربـەتی و تێکـەلاو کردنیان لەگەڵ کۆمەڵگا ، چونکە بەهەڵە بەم دیاردەیان دەوت حەزی تاکەکەسی .

( هەر چەندە مرۆڤ ئـەوە دەردەبڕێ کـە سۆشیالیستـە بـەڵام هێشـتا لەهـەموو کەسێک تەواو ترە ) بۆیە ( گیڤارا ) گوێی بە پرسیاری ئەوانە نەدا کە دەیان پرسی ، بـەڵام چۆن مرۆڤ دەتوانێ دژایەتی کۆمەلگاکەی بکا ؟، چونکە ئەم پرسیارە رەوابێژی نیـە ، لێرە ( گیڤارا ) لەگەڵ ئەفلاتون کۆکە کاتێک دەڵێ : ئەگەر مرۆڤ بیەوێ خۆی پـێ بگەیـەنێ ئەوا دەبێ لە ناو کۆمەلگا کۆمۆنیستیەکەیدا پێبگا ، کە وایە دەبێ دەنگی هـەموو کەسێک لە رێگەی ئامێری کۆمەلایەتیـەوە ببیسترێ نـەک دژی بـێ و دەبـێ هـەموو هۆکارەکـانی ناکۆکیی نێوان هەڤالان کە لەسـەر سامان رو دەدەن لـەناو ببردرێ ، دەبـێ کـارکردن بە ئەرکێکی کۆمەڵایەتی بناسرێ . ( دواجـار ئـامێر لـە هێلـی پێشـەوەیە و ئـەرکی خۆی بەجێ دەگەیەنێ ) .

ئەوکاتـــەی مـــرۆڤ لـــە کـــاری ئـــازاد کـــراو بـــەدوای پەیـــداکردنی خـــۆراک و پێداویستیەکانی خێزاندا گەرا ئـەوکات خۆی دەبینێتـەوە کـە ئـەرکێکی کۆمەلایـەتی بۆ گشت بەجێ دەگەیەنێ . ( گیڤارا ) وای دەبینێ کە کـار لـە دەولـەتی سۆشیالیزم دا دەبـێ بەزۆر بێ بەڵام وەکو کاسترۆ ووتی ناو بنرێ کـاری رەوشتانەی بـەزۆر ، ئەوەندە نابـا ئـەم رق لـێ بونەوەیـە دەبێتـە کـارێکی خۆبەخشـی ئەمـە دوای ئـەوە رودەدا کـە ویژدانـی کۆمەلگا زیندو دەبێتەوە .

بـە تێروانینـی ( گیڤـارا ) هونـەر ئـەو جیاوازیـەی نێـوان کۆمـەڵگای سـەرمایەداری وکۆمـەڵگای سۆشـیالیزمی ئاشـکرا کـرد ، لـە سـەرمایەداریدا هونەرمەنـد هێـرش دەباتـە سەر دەولەت ( بێکاری ورابواردن گرەنتیی پاراستنی ئارامیی مرۆڤـە لـە دلـەراوکێ ) ، لەگـەڵ ئەوەشدا شۆڕشـی راستەقینە ئـەزمونی هونـەریی لەخۆیـە ، باشتریش وایـە کـە هەرلـە بنەرەتـدا نـەیبێ ( ئـەو هونەرمەندانـەی خـاوەنی دەسـەلاتێکی مـەزنن لـە هـەمان کاتیشـدا خـاوەنی دەسـەلاتی شۆڕشـێکی مـەزنن ) دیـارە هێشـتا شۆڕشـەکە شۆڕشـێکی هونـەریە بۆیە ئەوانیش دەگرێتەوە ، هەروەها مرۆڤی سۆشیالیستی نوێش دەگرێتەوە.

رقی لەو روالەتە کۆمەلایەتیەی سەدەی نۆزدەهەم بوو کە لە روسیا و چین وەکو هونەر هێشتبویانەوە ، روالەتێکی کۆنەپەرستانە بوو . بەتەواوەتی وەکو هونەرەکەی سەرمایەداریی روخاو وابوو کە لە سەدەی بیستەم وەکو کاردانەوەی سەردەمە لەناوچوەکە ئەنجام درابوو . بەڵام ئەزمونە چاو نەترسەکانی یەک لەدوای یەک هونەرێکی نوێ دەدۆزنەوە کە لەگەڵ مرۆڤی سەدەی بیستەمی نوێدا بگونجێ . ئەم مرۆڤە نوێیانەش لە روی قوربانی وداهێنانەوە لە نێو سەرکردەکانی شۆڕشی کوبی بەدی دەکرێن.

ئەم جۆرە کەسانە بە هۆی هەستە رەسەنایەتیە کانیان خۆشەویست بون ، لەگەڵ ئەمەشدا ئەمان لە پێناو دۆزەکانیان خاوەنی هیچ پێکەوەنانێکی ژیانی خێزانی نەبون ، ئەوان هیچ ژیانێکیان لە دەرەوەی شۆڕشدا نەبوو ، دەبێ گەل وەکوو سەرکردەکانیان روەو پرۆلیتاریای راستەقینە هەنگاو بنێ ، کەسەکانی ئەم گروپە دەبێ حەز لە هاوکاری کردنی هەڤالانیان بکەن لە هەر کوێیەک بن ، لەسەر سەرکردەکانیش پێویستە گەلەکانیان روەو ئەم هەلوێستە ئاراستە بکەن .

( گیڤارا ) بە هەندێک بڕواو بنەمای گرنگ کۆتایی بە بەیاننامەکەی خۆی هێنا ، تیایدا هانی گەلی کوبییدا کە دەست بە پرسەکەیانەوە بگرن و بڕوایان پێی بێ .

( ئێمەی سۆشیالیستەکان زیاتر ئازادین ، چونکە ئێمە زیاتر خۆمان پێگەیاندوە ، ئێمەش زیاترمان پێگەیاندون چونکە ئێمە زیاتر ئازادین ...

قوربانیەکانمان قوربانیی وشیارانەن ، هاندانێکە بۆ ئەو ئازادیەی کە بنیادی دەنێین ، دەبێ ئێمە بەدەستی خۆمان مرۆڤی سەدەی بیست و یەک دروست بکەین ).

ئەمە ئومێدو ئامانجەکانی ( گیڤارا ) بوون ، هەمویان بە ئومێد بون ، کوبا هەموو خەونەکانی نەهاتنە ناودەست ، بۆیە دەبینین کە ( گیڤارا ) لە ئۆکتۆبەری 1964 لە گوتارێکی دا ئەو بێ ئومێدیە بە دەست نیشانکردنی هەڵەکانی حکومەتی کوبا لە بواری کشتوکاڵ و پیشەسازی دەخاتە رو و بلاوی دەکاتەوە ، زۆر بە رونی حوکم لەسەر هەڵەکانی حکومەت و هە لەکانی خۆی دەدا ، بەرێژەیەک لە رەخنەگرتن بسپۆربوو کە ئەوکاتەی رەخنەی لە خۆدەگرت دوژمنیش ئاوەها رەخنەی لێ نەدەگرت .

لە گوتارەکەیدا هێرشی بردە سەر سیستەمی یەک بەرهەمی ، بە نەفرەتی سەر دەوڵەتە تازە پێگەیشتوە کانی ناوبرد ، لایەنگریی لە سیاسەتی فرە بەرهەمی گرت کە رێگە چارەیە بۆ کرێکارەکانی گوندنشین و بەرهەمهێنانی بەشە خۆراکی خۆیان ، لە روی تیوریەوە راکانی راست بوون ، بەڵام لە روی جێبەجێکردنەوە ئەم سیاسەتە هەرەسی هێنا و سەرکەوتو نەبوو ، چونکە بۆ فرە بەرهەمی هەوڵی زۆر دران بەڵام هەوڵەکان سەرکەوتو نەبون ئەنجامەکەی بەوە گەیشت کە رێژەی بەرهەمهێنان دابەزی بۆیە دەبوایە کوبا بۆ سیستەمە کۆنەکە بگەرێتەوە کە ئەویش یەک بەرهەمی بوو بەرهەمە سەرەکیەکەش چەوەندەر دەبێ وەکو بنەمایەکی ئابوریی ولات .

ئێستا ( گیڤارا ) دان بەوە دەنێ کە بەرهەمهێنانی شەکر بە پشت بەستن بە ئیمپریالیزم و برسێتیی گوندەکانەوە ببەستێتەوە ، لە راستیشدا دەبوایە کوبیەکان چەوەندەر بەرهەم بێنن بەهۆیەوە پارەو پول و سامان پەیدا بکەن ، کەوابێ شەکر شەیتان نەبوو بەڵکو تەرازوی بازرگانی شەیتان بوو .

هەروەها هەڵەی لە هەمان شێوە لە پیشەسازیی کوبا رویدا ، ( گیڤارا ) دان بە سەرنەکەوتنی تەکنۆلۆژیای ورد و ئابوریی پێویست بۆ دامەزراندنی پیشەسازیی نوێ دەنێ . جارێکی تر بێکاری وپێویستی بە خۆ تێرکردن لە سەر ئاستی نەتەوایەتی هانی کوبیەکان دەدا بۆ ئەوەی بە خێرا ژمارەیەکی زۆری کارگەیان هەبێ ، ئەنجامەکەی بەوە گەیشت ، کوبیەکان هەندێک کاڵای خەراپیان وەبەرهەم هێنا کە زۆر بە خێرایی ئەمەیان کرد وبە نرخێکی بەرزیش لەسەریان کەوتەوە، بەهۆی بەرزی نرخی کەرەستەی خاو نە توانرا گیرو گرفتی کاڵا هاوردەکان چارەسەر بکرێ ، دەبوایە حکومەتی کوبی ئەوە بزانێ کاتێک ئەو پارە زۆرە بەو کەرەستە خاوانە دەدا نرخەکەی بەرز دەبێتەوە و جیاوازیەکی زۆر لە نێوان ئایدیۆلۆژیاو پراکتیک دا دروست دەبێ .

لێرەش دوبارە ( گیڤارا ) دان بەهەڵە و هۆکارەکانی دروست بونی ئەم جیاوازیە دەنێ .

کارێکی ئاساییە ئەم هەڵانە لە کەسێک روبدەن کە کەسێکی سەرەتایی بێ لەم جۆرە ئەرکانەیدا خاوەنی هیچ شارەزاییەک نەبێ دەبوایە رێبەرایەتی کاروانێکی بەپەلەی بەرهەمهێنان بکاو روبەروی هێزێکی سەربازی و ئابوریی دونیایەک بێتەوە کە پێی دەوترێ دونیای رۆژئاوا.

دەنگۆی پێویستی دروست کردنی کاڵاو پێداویستیەکانی تر لە ناوەخۆی ولات لە جیات هاوردەکردن لەو هەلانەبوو کە دەبوایە روبەروی کوبا بێتەوە . هەر بە کردارێکی ژمێریاری بۆمان دەردەکەوێ کە لە کاتی رۆژانی باتیستا هەموو ئەو شەکرەی کوبا دەیفرۆشت ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەیکری ، هەموو کاڵاکانی کوباش لە ئەمریکاوە بۆی دەهاتن ، بەڵام ئەمرۆ ئەمریکا بۆتە دوژمنی کوبا و سیاسەتی خۆی بەرامبەر بە ( گیڤارا ) گۆڕ یوە .

بەهۆی ئەو گەمارۆ ئابوریەی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە سەر کوبای داناوە کە مەزندە دەکرێ بەتەواوەتی هەموو کەرەستەیەکی لێ بریبێ ، کوبا ناچار بوە پشت بلۆکی سۆڤیەتی ببەستێ لە کاتێکا بە هەزارەها میل لێیەوە دورە .

ئەمە بیانویەکە بەدەست کوبا کە چاری نیە دەبێ پشت بە بەرهەمەکانی ناوەخۆ ببەستێ ئەزمونە تاڵەکانی رابردوو حالی حازری کوبا ناچاری کردوە بەرهەمی ناوەخۆ وەبەربێنێ ئەمەش هەر بە تەواوەتی وەکو ئایدیۆلۆژیا تایبەتیەکەی کوبی وا دەبێ .

هەروەها سەبارەت بە بیردۆزە ئابوریەکانیشی ( گیڤارا ) دان بەهەڵەکانی خۆی دەنێ ، ئەم هەڵانەش لەسەر دوو شێوەی لەیەک جیا هەڵکەوتون : زنجیرەیەک لە هەڵەکانی بەرنامەی پێنج ساڵەی روسی دوبارە کرانەوە لە کاتێکا بەرنامەو نەخشەکان بە

قۆناغێکی چەقبەستیدا تێپەڕی بوون ئەم نەخشەو پلانانە بریتی بوون لە بڕیار ونمونەی بەرهەمی سەرنەکەوتوو کە جێبەجێ کردنیان کارێکی ئەستەم بوو . هەڵەی دوەمیان بریتی بوو لەو زنجیرە بڕیارەی سەبارەت بە بەرەوپێش بردنێکی خێرا دەرکران کە لە تواناکانی خۆیان گەلێک زیاتر بوون .

بە بونی هەندێک هۆکار ئەم هەڵانە مەزنتر دەبن :

- نەبونی پارچەی یەدەکی ئەو ئامێرو چەکانەی لە ئەمریکا کردرابوون .

- نەناردنی هاوکاری ویارمەتیە کانی دۆست ودراوسێکان لە بلۆکی سۆڤیەتی بە شێوەیەکی رێک و پێک .

- کۆچکردنی بەربلاوی بەرێوەبەر وهونەرمەندە بۆرجوازەکان .

- پشت بەستن بە ئامار وبسپۆری.

- دەستگرتن بەسەر مولک ودوبارە دابەش کردنەوەی سامانە زەوتکراوەکان لە سالی یەکەمی شۆرش کارێکی زوو بوو ، ( گیڤارا ) جەخت لەسەر هۆکاری تریش دەکاتەو :

( دەبوایە کارگە وکێلگە و رێگاو بانەکانمان بێ بودجە نەبونایە ، نەدەبوایە داو و دەرمانی کشتوکالی وکەرەستەی خاو و پارچەی یەدەکمان لێ ببرێ . بێ شارەزاو رێکخستنی کارەکان لە میانەی ئەو ماوەدا تێکدەرانی هەلساندەوە سەر پێ ئەوان خاکەکانیان لێ پیس کردین گەلێک کاری تێکدەرانەیان ئەنجام دا ن، هەڕەشەکانی دوژمن بۆ سەرمان ناچاری کردین بانگەوازی لە گەلی کوبی بکەین بۆ لەشکر کۆکردنەوە لە ماوەی سالێکدا سێ تا چوار جار ئەمەمان کرد بەم کارانەمان ولاتمان پەککخست .

ئێمە هەموو هەڵەکانمان دەگەڕێنەوە بۆ بێ بەرنامەیی ونەخشەی سەرنەکەوتو، ئێمە لەم روەوە قەرزاری دوژمنین چونکە ئەوەی بەسەر ئێمەدا سەپاند کە لە توانای خۆمان زیاتر هەولی دابین کردنی پێداویستیەکان بدەین ، سەرەڕای هەڵەکانمان بەلام گەلێک سەرکەوتنیشمان بەدەست هێناوە ).

ئەگەر تا رادەیەکی زۆر بیردۆزەکانی ( گیڤارا ) لە هەڵەکانی بواری ئابوریی کوبا بەرپرسیارن بەلام بەهەمان ئاست لە سەرکەوتنەکانیش بەرپرسیارە، هەروەکو ( گیڤارا ) ش بڕوای وایە رێژەی سەرکەوتن بە رێژەی بەرهەم دیاری ناکرێ . کاتێک حکومەت لە کۆتاییدا دەسەلمێنێ سەرکەوتوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ ئاخۆ جەماوەر پشتگیری حکومەت بوە یان نا . جیاوازیەکە لێرە دەردەکەوێ . کۆمەڵگای لیندون جونسۆنی مەزن لە شەش ساڵەکانی سەرەتاییدا بەرنامەیەکی دارشتبوو لە بەرنامەو نەخشەی کوبا گەلێک خەراپتر بوو ، بەلام گەلی کوبی لە تەک حکومەتەکەی و بەرنامەکەی وەستان ، کە چی گەلی ئەمریکای باکوری پشتی لە حکومەت و بەرنامە کەی کرد .

بەڵکو فیدل کاسترۆ مەزنترین ژیانپێدەری ئومێدەکان بێ لە دونیا ، چونکە ( گیڤارا ) گەلێک بیرۆکەی ژیان پێدانەوەی ئومێدەکانی پێ بەخشیبو. ( گیڤارا ) بە مەزنترین

سەرکەوتوی هاندەرەکان و قوربانی نەدان لە پێناو دەسکەوتەکانی مادی وئـابوری دێتـە ئەژمار.ئەگەر فێری کاری بنیادنانی سۆشیالیزم نەبوایە ئەوا ئێستا سـەرباری حەوانـەوە تایبەتیە کان هیچ کرێکارێکی سڤیلیت نەدەبینی ئەمرۆ هاوکاری حکومەتەکەی کوبا بکا

ئەگەر ئەمە بوبێتە هۆی دابەزینی ئاستی بژێوی نیوەی سـەرەوەی کۆمـەڵگای کـوبی و کۆچکردنی یەک لەسەر پێنجی ئـەم چینـە ، بـەڵام ئـەوەی تـر کـە مـاوە لـە پێنـاو شۆڕشدا فێـری بنـەمای رەوشـتی بونـە. دەسـتەواژەی ( گیڤـارا ) سـەبارەت بـە مـرۆڤ و بـرواو متمانەی بە مرۆڤ ئەوەیان سەلمان کـە ئـەم دەستەواژەیە لـە کوبـا راستەو بـونی هەیـە ، مرۆڤ تەنها ژمارەیەک نیە لـە بانـک دانـرا بـێ ، کۆمـەڵگاش ئوردوگایـەکی سـەربازی نیە بۆ دەربەدەرەکان ئامادە کرابێ .

شۆڕشی کوبی سەرەڕای دوژمنە دەرەکیەکان ودابران وهەڵەکانی ئابوریی ئەوساش توشی روخان نـەهات ، ئـەوە بۆی نوسرابو کـە ئەگـەر بیرۆکـەکانی ( گیڤـارا ) نەبونایـە لەسـەر کۆمۆنیسـتە وشـکەکان و هەلپەرسـتەکان ئەوانـەی لـە هـەوڵی دەسـت درێـژی وگـەمارۆدانی دابـون خـەریکی ئـەوە بـون بـە ئەزمونـە سـەرنەکەوتوەکەی سـۆڤیەت بیکوژن ، ئەوا دەمێک بوو دەبوایە لاواز بێ وشکست بێنێ و لە ناو بچێ .

ئەگـەر بـەهۆی ( گیڤـارا ) وە دۆخـی ئـابوریی کوبـا بـەرەو هەڵـدێر چـوو بـەڵام جگـە لـە کاسترۆ کەسی ترمان نیە لەو باشتر بێ . بارو دۆخـی کوبـا لـە سـەر لێـواری کۆمـەڵگا یەکی نوێیە لە دونیایەکی نـوێ ، ئـەمرۆش لـە خوێندنگاکان هـەموو منداڵـەکان بەیەکـەوە دەڵێن ( ئێمە لە داهاتوو وەکو ( گیڤارا ) دەبین ) .

-----------------

**بەشی شەشەم**

**گەران بەدوای رزگاری**

ژیانی جەگناوەری شۆڕشگێر ، ژیانی خەڵکانی تر ناخۆش دەکا ، چۆن (تۆم ) گاتسبیی مـەزن بـەدوای ئـاژاوەو دوبەرەکیدا دەگـەرا کـە لـە میانـەی یاریـەکی تـۆپی پـێ ی کـات بەسـەر چـو بـێ ، ئاوەهـا ( گیڤـارا ) لـە پشـتی نوسـینگەکەیەوە دانیشـتبوو بیـری لـە رۆژەکـانی ئەلسـیرا مایسـترا دەکـردەوە کـە رۆژگارەکـانی بەسـەر چوبـون ، ( گیڤـارا ) جۆری ئاشتیی لە شەڕدا دەبینیەوە و ئازادی خۆشی لە ئازادی خەڵکانی تردا دەبینیەوە .

( گیڤارا ) لە ساڵی 1960 بەدواوە وەکو بـالوێزێکی گـەرۆکی فیدل کـاری کـردوە ، بـە نێردراوی تایبەتی بۆ گەلێک ولاتی وەکو سۆڤیەت سەردانی ناسـەرکەوتوی ئـەنجام داوە هـەروەها سـەردانی ڤێتنـام ی بـاکورو ولاتـانی کۆمۆنیسـت و ولاتـە بێلایەنـەکانی تـری کـردوە . ئەوکاتـەی بەمەبەسـتی گـەران بـەدوای بیـرو بڕواکانیـدا لـە 1965 لـە کوبـا دەردەچـێ کـە ببێتـە جـەنگاوەرێکی گـەرۆک لـە دەوری دونیـا . بـەم کـارەی ( گیڤـارا )

بیروبرواکانی بە کردەوە جءبەجێ دەکردن ، چونکە بە بروای ئەو ئەرکی شۆڕشی کوبایە هاوکاری ولاتەکانی تر بکا بۆ جەنگین دژی ئیمپریالیزم .
لەدوای سەفەرەکەی ( گیڤارا ) دا هەندێ هۆکار هەبون ، پەیوەندیەکانی ( گیڤارا ) لەگەڵ فیدل کاسترۆ سەرەڕای ئەوەی دوو هەڤالی ڕێگەی سەختی خەبات بون بەڵام هەندێک سەختی وتەگەرەی تێ کەوتبو.
شۆڕشی کوبا هەموو کاتەکانی کاسترۆی داگیر کردبوو کاسترۆ پێیەوە بە دروستی خەریک بوو بەڵام ئەوەی ( گیڤارا ) پێیەوە خەریک وبۆی پەرۆش بو فراوان کردنی بازنەی جەنگی دژی ئیمپریالیزم بوو کە بە شێوەیەک سەرتاسەری ئەمریکای لاتین بگرێتەوە ، فیدل کاسترۆ لە توانایدابو خۆی بۆ شۆڕشی کوبا تەرخان بکا ، بەڵام ( گیڤارا ) لە توانایدا نەبوو ئەمە بکا ئارەزوی ئەوەی هەبوو بۆ کاری شۆڕشی دەرەوەی کوبا کار بکا ، فیدل سەرکردەو فەرماندەی کوبا بوو بەڵام ( گیڤارا ) دەیەویست ببێتە سەرکردەو فەرماندە لە شوێنێکی تر ،یەکەمیان ( فیدل) شۆڕشی بردەوە ، دوەمیان (چی) مەبەستی بوو شۆڕشێکی تر بباتەوە ، فیدل سیاسەتمەدارێکی بەتوانا و بەهرەمەند بوو ، بەڵام ( گیڤارا ) وەکو خۆی جەنگاوەرێکی دیار ودرەوشاوە بوو ، فیدل خۆشیی بە گوتارخوێندنەوەو نەخشەکێشانی نەتەوایەتیی و دبلوماسیەت دەکرد بەڵام ( گیڤارا ) لە ووتەی بێ کار وبێ بنەماو سازشکاری بێزار بوو . لەمەش زیاتر بە دیدی فیدل وبیرۆکەکانی ( گیڤارا ) بە خێرا هەرس ناکرێن ، ( گیڤارا ) بە سەرنەکەوتن رازی نەدەبوو پێی قەبول نەدەکرا .
لە پایزی 1964 ( گیڤارا ) ئاگاداری کاسترۆ دەکاتەوە کە دەیەوێ لە کوبا بچێتە دەر بۆ ئەوەی لە شوێنێکی تر دەست بە خەباتی رزگاری بکا کە بە نیازە تا رزگارکردنی سەرتاپای ئەمریکای لاتین رزگار دەبێ خەبات بکا ئەم خەباتەش لە بۆلیڤیاوە دەست پێ دەکا ، هەرچەندە فیدل زۆر هەولی دا لەم بریارەی پاشگەز بێتەوە بەڵام کاتێک سودی نابێ هەوڵدەدا یارمەتیی بیرۆکەکەی بدا بۆ نەخشە دارشتن بۆ شەری پارتیزانێکی نوێ .
( گیڤارا ) تاقە جەنگاوەر نەبو کە لە ئەلسیرا مایستراوە هاتبێ بۆ ئەوەی دوبارە دەست بە خەباتی چەکداری بکاتەوە ، ئەوتیریا بۆیتیرز کە ئەندامێکی ئەم گروپە ی ( گیڤارا ) دەبێ دەگێرێتەوە :
( لە نێوماندا هەندێک لەو جەنگاوەرانە هەبون کە لە کاتی سەرکەوتنمان لە گەل باتیستا دەیان ووت هەر دەبێ ئێمە لە ولاتێکی تریش شۆڕش بکەین و بجەنگین ) نەک تەنها ئەوەندە بەڵکو زیاتریش، بیرۆکەی جەنگین دژی ئیمپریالیزم و درێژە دان بە جەنگی رزگاری بیرۆکەی هەموو سەرکردەکانی شۆڕش بوو .
کاتێک ( گیڤارا ) نامەی خواحافیزی بۆ کاسترۆ دەنوسێ دەڵێ:
( گەلانی تر هەن پێویستیان بە توانا ئاساییەکانی ئێمە هەیە ، من دەتوانم ئەو کارە بکەم کە تۆ ناتوانی بیکەیت ئەمەش بەهۆی بەرپرسیارێتیەکانت بەرانبەر بە کوبا وەکو سەرکردەی کوبا وەیە )

لەم دەستەواژەی ( گیڤارا ) ئەوە بەدی دەکرێ کە ( گیڤارا ) بە پەرۆشە بۆ کاسترۆ چونکە وەکو ئەو ناتوانێ بەم ئەرکە پیرۆزە هەلسێ لە کاتێکا ئەم (( گیڤارا )) دەرفەتی بۆ هەلکەوتوە .
لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک ( گیڤارا ) بریار دەدا بگەرێتەوە بۆ مەیدانی جەنگ ئەوکاتە لە ناوەراستی تەمەنیدا بوە ، نەخۆشیی تەنگە نەفەسیی هەبوە و بەهۆی ئەوەی ماوەیەک لە گاریبالدی وزایانا کاری بەرێوەبردنی کردوە ماندو بونی پێوە دیاربوو ، دواتر کەمن ئەو سەرکردانەی دەستیان لە نازو خۆشی دەسەلات هەلگرتوەو گەراونەتەوە مەیدانی جەنگ ، ئەمە تەنها لەم دوو سەرکردەیە دەوەشێتەوە کە بەهۆی تواناکانیانەوە بونە ئەفسانەی سەردەم .
ئەم بریارەی ( گیڤارا ) زیاتر لەوەی کە بنەمایەکی رۆمانسیی هەبێ بنەمایەکی پەند وەرگرتن و تێگەیشتویی هەیە ، بونی ( گیڤارا ) لە مەیدانی شەر سەنگی خۆی هەبوو تەنها بونی ئەم بەرانبەر بە بونی یەک بەتالیۆنی تانک وابوو ، ئەوکات بزوتنەوەی شۆرشگێری جیهانی لە کوبا دیمەنێکی رۆژانەی هەبوو خوێندنگای مەشق بوو لە شۆرشگێر و دورخراوە سیاسیەکان پنگابوەوە . هەروەها سەرقالی کۆنگرەی یاخی بوە چەکدارەکان بەشێوەیەک وابوو کە ولات لە سەمایەکی بەردەوامی دابوو ، ئەمەو گەمارۆ ئابوریەکەی سەر کوبا هەستی نەتەوایەتیی دەبزواند .
ئەو کات ( گیڤارا ) یەکەم کەس دەبێ کە رقی لە گەرانەوەیە بۆ کوبا ، چەند هەزار کەسێکی کوبی لە دەرەوەی کوبا بەهۆی شۆرشەوە گیانیان لەدەست دابوو ، 17 کوبی هاوسەفەری ( گیڤارا ) بون بۆ پۆلیڤیا لەوانە هەندێک کۆنە جەنگاوەری ئەلسیرا مایسترا بون هەروەها لە ناویاندا چواریان پلەی بەرزیان لە سوپای حکومەتە کەی کوبا هەبوو، چواریشیان لە ئەندامانی لیژنەی مەرکەزیی حزبی کۆمۆنیستی کوبی بون ، ئەمەش بەرزترین پلە بو لە کوبا ، دوانیشیان لە تەمەنی چل ساڵیدا بون یەکێکیان وەزیر وئەوی تریان بەرێوە بەری کانگا بوو ، نمونەی وەکو ( گیڤارا ) کە بتوانێ ئەم پایە بەرزانە بۆ مەیدانی جەنگ بنێرێ کەم بون ، بەراستی ئەم شۆرشە جێی مەترسی بوو دەبوایە لە لایەن ئەم دورگەوە خاوەنداریێتیی بکرێ چونکە ئەم دورگە بچوکە بەهۆی گەمارۆوە هەستی بە دابرانێک دەکرد بۆیە پێویستی بە شۆرشێک ودوانی تر هەبوو .
هۆکارێکی تری کەسی لای ( گیڤارا ) هەبوو بۆ ئەم چونەی ، ئەویش ئەوەیە کە ( گیڤارا ) کەسێکی ئەرجەنتینی بوو هەرچیەکی بلێ کە گوایە وا هەست دەکا ئەو لە ولاتی خۆیەتی بەلام تا ئەوکات ئەرجەنتین ولاتێکی سەرمایەدار وبێ چاکسازی بوو .
هەر بە هەوڵ و هیمەتی ( گیڤارا ) هەڤالێکی تر خۆی وسیانزە کەسی تر دەرچون هەندێکیان کوبی بون بەمەبەستی رزگار کردنی ئەرجەنتین لە دارستانەکانی باکوری ئەرجەنتینەوە دەستیان بە شۆرش کرد ، دوای دە مانگ لە گەران وهیلاکی وماندوێتی و پەراگەندەیی ئەم هێزەی ماسیتی بەدەستی هێزەکانی ئەرجەنتین هەمویان لە ناو دەچن . ئەم کارەساتەی ماسیتی گیانی ( گیڤارا ) ی هەژاند چونکە بەراستی ئومێدێکی زۆری

پێ بوو کە لە داهاتوو  بەیەک بگەن ، سەرەڕای ئەوەی بەقەدەر ئەوەی کە فیدل لە سەرنەکەوتنەکەی ( گیڤارا ) لە پۆلیڤیا بەرپرسیار بوو ، ( گیڤارا ) ئەوەندە لە سەرنەکەوتنەکەی ماسیتی بەرپرسیار نەبو .
کارێکی ئەستەم بوو هاوکاری بە کۆمەڵێک شۆڕشگێری دابڕاو لە قۆناغی یەکەمی دەستپێکردنیدا بگەیەنی ،چونکە ئەم هێزە دابراوەو بەتەواوەتی سەربەخۆیە مانەوەی بەندە بە خۆیانەوە .
کاتی ئەوە گەیشتبو کە ( گیڤارا ) کوبا جێ بهێلێ چونکە سیاسەتی ئابوریی کوبا شکستی هێنابو ، روسەکان وولاتە ئەوروپیە رۆژهەلاتیەکان لەو هاوکاریەی بەردەوامی کوبا وایان دەبینی کە ئەمە خوێن بەردانە لە ئابوریی ولاتەکەیان بۆیە فشاریان خستە سەر حکومەتی کوبا بۆئەوەی چاکسازی لە سیستەمی ئابوریی ولاتەکەی بکا . هەروەها روسەکان مەبستیان بوو کوبا دوبارە شەکریان پێبدا لە بەرانبەر ئەوەی ئەوانیش کالا بەرهەم هێنەکانی روسیایان بدەنێ و پاڵپشتی لە دەسکەوتە پیشەسازیەکانیان بکەن .بەڵام ( گیڤارا ) هەرگیز ئەم سیاسەتە ی پێ قەبول نەبوو بۆیە بریاری دا دوبارە درێژە بە گەشتەکانی بداتەوە ، دایکی ( گیڤارا ) لە دوانامەی کە لە ( گیڤارا ) وە بەدەستی گەیشت هەستی بە مەرامەکانی ( گیڤارا ) کردبوو بۆیە بۆی دەنوسێ :
( ئەگەر هەموو رێگاکانت لە کوبا لێ داخراون ئەوا بن بێلا لە جەزائیر زۆری پێ خۆش دەبێ بچیتە لای و بە ئامۆژگاریەکانت بۆ بوژانەوەی ئابوریی ولاتەکەی هاوکاریی بکەی ، هەروەها نکرومای گانا ش پێی خۆشە بچیتە لای هەرچەندە لەوێ نامۆ دەبی بەڵام وادیارە ئەمە چارەنوستە) . بۆیە دەبوایە ( گیڤارا ) جولە بکا .
بە دوبارە ناردنەوەی ( گیڤارا ) بۆ مەیدانی جەنگ کارەکان ئالۆز بوون ، سالی 1963 رۆژنامەی ( مجاهد) زمانحالی حکومەتی جەزائیر دەنوسێ کە پرسی شۆڕشی ئەمریکای لاتین پێویستی بە هەلوەستە هەیە .
( گیڤارا ) وەکو کەسێکی کاریگەرو راشکاو ئەم دۆخە بیروکراتیەی کوبا کە درێژەی کێشابو پێ هەلنەگیرا ، لە 1964 لەسەر ئەرکەکانی حکومەت دەنوسێ ( چونکە کارەکە گرنگە وئەرکی حکومەتیشە بۆیە دەڵێم ئەم کارە هەڵدەوەشێتەوە و حکومەت هیچی بۆ ناکرێ ) بەراستی ئەو خۆی لەو کارە سادەوساکارانەو ئەنجامەکانی شۆرش کە وەدەستی هێنابون لە رابردو دەپاراست .
نامە خواحافیزیەکەی بە دەربڕینی شینی و شادی نوسیبویەوە ، بە دەستەواژەی :
( من وەکو مرۆڤێکی بنیادنەر لەدوای خۆم جوانترین وپاکترین خەون جێ دەهێلم ) نوسیبوی ، رزگار بونی لە خەیالی کاری بەرێوەبردنی ولات دەربری.
( گیڤارا ) هەستی دەکرد کە هەموو ئەوانەی لە دەوری کۆبونەتەوە شەڕکەر وشۆڕشگێرن هەرئەم رۆحیەتەش بو هانی دەرچونی دا . لە دواییدا بۆ کاسترۆ دەنوسێ کە لەسەر خۆی نەزر کردوە پیرۆزترین ئەرک بەجێ بگەیەنێ کە ئەرکی خەباتی دژی ئیمپریالیزمە لە هەر کوێیەک بێ ) بە دروستیش ئەمەی گەیاندە جێ .

کاتێک فیدل کاسترۆ لە دوای مردنی ( گیڤارا ) دێت و دەڵێ :
( لە داهاتو ( گیڤارا ) دەبێتە نمونەی قارەمانێک کە هاو شێوەی نەبێ ، ( گیڤارا ) دڵ و دەرون و ئەقلی لە نیشتمان پەروەریی تەسک ودەمارگیری نەتەوایەتی رزگار بو )
لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە راست نەبوو کاتێک دەیانووت ( گیڤارا ) لە سالەکانی نێوان 1959 تا 1964 خزمەتکارێکی دلسۆزی کوبا بوە ئەوکاتەی بالوێزی کوبا دەبێ وبۆ هەرشوێنێک بچوبایە بەرگری لە سیاسەتی کوبا دەکرد ، ( گیڤارا ) زۆر بە دلسۆزی دبلۆمەسیەتی نێودەوڵەتی کوبای دەبرد بەرێوە هەر لە شەڕی دەرونی لەگەڵ ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا تا هاندانی بزوتنەوە رزگاریخوازەکانی ئەمریکای لاتینی و تا پەیوەندیە دۆستانەییەکانی لەگەڵ ولاتانی کۆمۆنیست.
هەروەکو ئەوەی ( گیڤارا ) لە نێو نەتەوایەتیی کوبی توابێتەوە ئاوەها بوو .
لەدوای 1964 ( گیڤارا ) دوبارە پابەندیە کۆنەکەی خۆی نوێ کردەوە سەبارەت بە بەرگری کردن لە نەتەوە هەژارەکانی دونیا ، وا دەبینرا کە ( گیڤارا ) بڕوای وایە ململانێی راستەقینە لە نێوان سەرمایەدار وکۆمۆنیستەکاندا نیە بەڵکو لە نێوان ولاتە هەژار و ولاتە دەولەمەندە کاندایە ، زۆر لەو مەرجانە نیگەران بوو کە روسیاو دەوڵەتە سۆشیالیستەکانی ئەروپا لە بەرانبەر هاوکاری کردنی کوبا و ولاتەکانی هەرسێ کشوەرەکەی (ئاسیا وئەفریکا وئەمریکای لاتین ) بۆ کوبا هەیان بوو .
دوو دونیا بەروی جیهانی سێیەم وەستانەوە یەکەمیان دونیای رۆژهەلات ئەویتریان دونیای رۆژئاوا ، سەرەڕای ئەوەی لە راگەیاندنە سیاسیەکانیان ئەوەیان رادەگەیاند گوایە سیاسەتی هەر یەک لەم دوو دونیایە دژی ئەوی ترە بەڵام لە راستیدا هەردوکیان لە کوتلەی بەهێز و ولاتی پێشکەوتو پێک هاتبون و ئاستی بژێویان بەرزو بێ کەم و کوری بوو ، بەم سیاسەتەیان سنوری ولاتە هەژارو نەدارەکانیان کێشابوو ئەم سنورەش جیا بو لەو سنورو نەخشەی کە سەرمایەدار وکۆمۆنیستەکان کێشابویان ، دروستکاری کاڵا وپێدەری کەرەستەی خاو، سنورێکیان بۆ مولکدارو نەداران بۆ گەلانی رەش پێست وسپی پێست و هێزی داگیرکار و سامانە کۆنەکان دانابوو ، ئەم سنورە لە سنوری نێوان دوو دەولەت زەق تر و کاریگەر تر بوو، بەم سنورەیان جیهانێکی نوێیان دیاری کردبوو کە بە جیهانی سێیەم ناونرا ، دور بوو لە دونیای رۆژئاوا و رۆژهەلات.
دەستەواژەی ( گیڤارا ) ی جیهانی سێیەم بەسەر بیرکردنەوەی جەماوەری ناوەخۆدا زاڵ بوو ئەم دەستەواژەیە خەڵکی بەرەو بیرکردنەوەو بەڵکو کۆمبونی دیبلۆماسی کێش کرد . دیارە هەر ئەمەش ئامانجی ( گیڤارا ) بوە هەروەکو لە گوتاری کۆنگرەی بازرگانی وبژاندنەوەی سەربە نەتەوە یەکگرتوەکان دەربڕی لە ئاداری 1964 .
نابێ کێشەو ململانێ لە نێوان ولاتە هەژارەکان لەسەر وەرگرتنی قەرز لە ولاتە بەهێز ودەولەمەندەکان روبدا بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێ دەست بە یەکریزی خۆیانەوە بگرن .

ئەگەر دەوڵەتە بچوک و هەژارەکان کێشە لە نێوان خۆیاندا دروست بکەن لەسەر وەدەست هێنانی جەمێکی ولاتە بەهێزەکان و دەرفەت برەخسێنن کە یەکریزی لەت بکەن ... ئەوا ئەم جیهانە هەر بەم شێوەیە دەمێنێتەوە .
دەبێ نەتەوە هەژارەکان ئەوە بزانن کە نابێ لەسەر پێدانی کەرەستەی خاوو بەرزکردنەوەی نرخ یەکتر بێزار بکەن ، نابێ بەرتیل قەبول بکەن تەنها بۆ ئەوەی بەدوای یەکێک لە کوتلەکانی رۆژهەلات یا رۆژئاوا رابکەن وکلکایەتیان بۆ بکەن .
( گیڤارا ) بەبەردەوام چاکەو سود و سەندیکای کرێکارانی لە ولاتە هەژارەکان بەرز دەنرخاند ، هەر بە یەکیەتی هێز وتوانا بەسەر سازشدا زال دەبێ ، هەر میلەتێکی رەفتار و هەڵسوکەوتی گەری بکا ئەوا ئەو میلەتە بێ ئابروە .
وتەکانی ( گیڤارا ) کاریگەریی زۆریان بەسەر ئەو کەسانەدا هەبوو کە خۆیان وەکو ئەو ئەکتەرانە دەهاتە بەر چاو کە لە پەرتوکەکەی بەناوی (ئازارکێشەکانی زەوی ) هی فرانز فانون دا هاتبو و زیاتر لەو ئازار کێشانەی کە لە ناو گۆرانیەکەی بەناوی (ئەنتەرناسیۆنال) داهاتوە کە هەمویان هەژاری میلەتێکی پیشەسازکار بوون .
لە گوتارەکەیدا کە لە کانونی یەکەمی 1964 لە نەتەوە یەکگرتوەکانی خوێندەوە هەلوێستێکی دوژمنکارانە تری وەرگرت . ئاماژەی بەوەدا کە خەریکە متمانە وبروا بە چارەسەریە ئاشتەواییەکان بەردەدا بە پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان ورێککەوتنە بازرگانیەکانیشەوە ، هەروەها بە وتوویژ وهاوکاریەکانی بێگانەش چونکە ئەمانە چارەسەری ئەم کێشەی نێوان هەژار و دەولەمەند ناکەن ، لە هەمان کات رادەگەیەنێ کە:
( پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی نێوان نەتەوەکان ، پێکەوە ژیانی نێوان چەوساوەو چەوسێنەران، ژێردەست و داگیرکاران ناگرێتەوە ، ئەمە هێرشێکی راشکاوانەیە بۆ سەر روسیا کە لە هەولی پێکەوەژیانی ئاشتیانەدا بوو لەگەڵ ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ، ئەمە دوای ئەوە ئاشکرا دەبێ کە کندی کار لە خرۆشۆف دەکا بۆ ئەوەی رازی بێ رۆکێتەکانی لە کوبا بکێشێتەوە ، جگە لەمە ئەمە وەکو راگەیاندنی شەر وا بوو دژی ئیمپریالیزم .
لەهەمان گوتار ( گیڤارا ) باس لە و روداوانە دەکا کە لە رۆژی کوشتنی لومامبیاو لە کوبا رویان داوە ، دیارە ئەمەش خۆ پاککردنەوەیە لە و پەیمانە تایبەتیانەی کە لە ناوچەکە دابونی .( دەبێ ئازادیخوازان خۆیان ئامادەکەن بۆ تۆلە سەندنەوە لە و تاوانەی لەگەڵ کۆنگۆ ئەنجام درا ) هەستی بەرامبەر بە پشتگیری گەلانی سپی دەربڕی ئەمەش بەوە کرا کە ئەو تاوانانەی رسواکردن کە گەلە سپیەکان بەرانبەر بە گەلانی ئەفریکا ئەنجامیان دەدەن .
( ئەم تارمایی و پەردە رەشەی بەرچاومانی لابرد ئاسۆی نوێی بۆ کردینەوە ، ئێستا ئەوەی دوێنێ بە هۆی کۆیلایەتی نەما دەتوانی ببینین ئەمرۆ بەرونی لێمان دیارە ئەویش خۆی لەوەدا دەنوێنێ کە (شارستانیەتی رۆژئاوا ) خۆی لە ژێر پەردەی بریقەداری شاردۆتەوە بەلام لە راستیدا شانۆیەکی پڕ لە تەم ومژە .

ئەمـە ئـەو نـاوە راستەقینەیە کـە بـۆ ئـەنجام دانـی کـاری مرۆڤایـەتی چونەتـە کۆنگۆ ، خـوێنی گـەلانی هـەژار بۆتـە خـواردنی خـوێن رێـژان ، ئەمەیـە ئـەو کـارەی ئیمپریـالیزم دژی ئادەمیزاد دەکا ، کە نیشانەکانی ئیمپریالیزمی سپی پێستەکانە .
تورەبـونی هـەژارەکان تـام وشـێوازی جیـای هەیـە لەگـەڵ دەربرینـەکانی ( گیڤـارا ) .
ئەوەی ( گیڤارا ) دەیڵێ ئەوەیە کە ئەو کات لە مێشکیدا دەخولایەوەو بیری لێ دەکردەوە و لـە دوارۆژ پێـی هەڵسێ . لـە ژێـر رۆشـنایی ئـەم هەسـت و دەربرینانـەی ( گیڤـارا ) دەتوانین لەوە بگـەین ئـاخۆی ( گیڤارا ) بۆچی چۆتـە کۆنگۆ ، وەکو ئەنجامـەکانی ئـەو رەشـبینی وبـێ ئومێدیـەی ( گیڤـارا ) کـە وەکـو کەسـێکی بەشـداربوی بنیادنـەری کوبـا دەری دەبـری ، هـەروەها لـەو بـێ ئومێدیـەی لـە هاوکاریـە مەرجـدارەکانی ولاتـە کۆمۆنیستەکانی رەشپێستەکان کە بە دەوڵەتە دواکەوتوەکانیان دەدا ، وەکو دەربـرین لـەو دیاردە نارەوایانە دەستی لە پۆستە ئیداری ودبلوماسیەکانی خۆی هـەڵگرت کـە چەنـدین سـاڵ بـو وەکـو شۆڕشـگێرێکی گـەرۆک تەمـەنی ژیـانی لـێ بەسـەر بردبـو ، دواتـر لـە تەمـەنی گـەنجێتییدا مانـدوبونی نـەدەزانی ئامـادەبوو جـارێکی تـر لەگـەڵ هـەژاران ژیـان بەسەر بەرێ و لەتەک زەحمەتکێشانی خاک لە هەرکوێیەک بن بژیێ .
( گیڤـارا ) لـە کـۆنگرەی هاوکـاریی ئەفریکیـدا کـە لـە جـەزائیر لـە شـوباتی 1965 بەسـترا بیرو را کـانی باشـترو تونـدتر دارشـتنەوە ، تیایـدا زۆر بـە رونـی و راسـتەوخۆ هێرشی کردە سەر سیاسەتی روسی ، حکومەتی کوبا بەم وتانەی ( گیڤارا ) حەپەسـاو پێێ شـلەژا ، روسـەکانیش لێـی نیگـەران بـون و زۆریـان پـێ سـەیر بـوو کـە دوای ئـەو هەموو هاوکاریانەی بە حکومەتی کوبا دراون بەم شێوەیە هەڵوێست دەربـرن و وەلامـی هاوکاریەکانیان دەدەنەوە ، روسەکان بۆ ئەو هێرشانەی ( گیڤارا ) بۆ سـەر روسـیا هیچ پاسـاوێکیان لا پەسـند نـەبو ، بـەڵام دەبوایـە روسـەکان ئـەوە بزانن کـە هیچ منـەتێک لـە هاوکاریـەکانی بێگانـەدا نیـە ، ( گیڤـارا ) رایگەیانـد کـە دەبـێ دەوڵەتـە سۆشیالیسـتەکان پەیوەندیەکانیان لەگەڵ دەوڵەتە داگیرکارەکانی رۆژئاوا یەکلایی بکەنەوە هەرچەندە لای ئەو دەوڵەتـە سۆشیالیستەکان دیـاری نـەکرا بـەڵام ئـەوەی بـۆ ئـەو گرنـگ بـوو نـەهێشتنی چەوسانەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە بو ، نـابێ هیچ ولاتێکی سۆشیالیسـت بـە شـان و باڵی خۆیدا هـەڵبڵێ ئەگـەر یارمـەتی دەوڵەتـە سۆشیالیستەکـانی دونیـا نـەداو روبـەروی ئیمپریالیزم نەبێتەوە .
بـۆ ئـەم کێشـەو ململانێیـە هیچ سنورێک نیـە ئەمـە تامردنـە ، نـاتوانین گـوێ نەدەینـە روداوەکـانی ئـەم دونیایـەی دەورو بـەرمان ، سـەرکەوتنی هـەر ولاتێـک بەسـەر ئیمپریالیزمدا ، سەرکەوتنی ئێمەیە بەسەر ئیمپریالیزم ، هەروەها شکستی هەر ولاتێک شکسـتی ئێمەیـە پیـادە کردنـی نێـو نەتـەوەیی تـەنها ئـەرکی ئـەو ولاتانـە نیـە کـە لـە پێنـاو سەربەخۆ رزگاری و دوارۆژیاندا خەبات دەکەن ، بەڵکو زەرورەتێکە دەرچونی نیە .
هەمیشە هەوڵی پیادە کردنی ئەوەی دەدا کە خەباتی بۆ دەکـا ، سـەرکەوتن وئازارەکـانی لە و هەلانەوە بون کە بە نادەستی لە زمانی دەردەچوون ، ئەمە دوا پـەیامی بـوو بـەر لـە دەست بەکار بونی لە کارە نوێکەیدا .

هەرچەندە ماوەیەی 18 مانگ لە دوا ساتەکانی ژیانی بە شاراوەی ماونەتەوە ، بەڵام بە مسۆگەری دوبارە دەگەڕێتەوە کوبا دوای ئەوەی جارێکی تر بۆی دەردەچێ بۆ کۆنگۆ بۆئەوەی شەری خۆفرۆشە سپی پێستەکان بکا کە تەنگەی پێ هەلچنی بون ، بەر لەوەی لە کوباش دەرچێ نامەیەکی خواحافیزی بۆ فیدل کاسترۆ دەنێرێ تیایدا هاتوەکە :
( هەول دەدا بۆ بیرو بڕواکانی دلسۆز بێ ئەگەر هەرچیەکی روبدا ، هەمیشە لەگەڵ دەستکەوتەکانی شۆڕشی جیهانیی کوبیدا یەک بوو ، لەگەڵ خۆیدا بۆ کۆنگۆ هەندێک لەو هەڤالانەی کە لە ئەلسیرا مایسترا لەگەڵیدابون بردنی، هەندێکیان دواتر درێژەیان بە کاروانی خەباتی خۆیان دا بۆ پۆلیڤیا چون .
ئەوەی لە کۆنگۆ بەسەر ( گیڤارا ) هاتوە تا ئێستا شاراوەن ، ئەوەی دروستە ئەوەیە کە لە کۆنگۆ لەگەڵ تیپە چەکدارەکەی کە مولیل و سومالیوت فەرماندایەتیان دەکردن دژی چومی ،یەکیان گرتەوە ، لەگەڵ هەڤالانی تری کوبی لە هەوڵی مەشق پێکردنی جەنگاوەرانی کۆنگۆیی بون بۆ ئامادە کردنیان بۆ شەری پارتیزانی ، بەڵام بۆیان دەرکەوت کە خۆبەخشەکان لە ئاستی پێویست دا نین ، دوای نۆ مانگ لە ماندو بونی بێ سەرکەوتن بریاریان دا وڵات جێ بهێلن ، لە توانایانـدا نەبوو لەوەی لە ئەزمونەکەی خۆیان فێری بون خوێندکارە کۆنگۆییەکان لەوە زیاتر فێری مەشق وراهێنان کەن ، راپۆرتەکان ئەوە دەگەیەنن کە هۆکارێکی تر هەبوو بوە مایەی بێزاری ( گیڤارا ) ئەویش ئاشکرا بونی بوو ، لەتەک ئەمەش بونی خۆفرۆشە سپی پێستەکان ومرۆڤ خۆر و خوێن رێژەکان هەبون ، ئەمجارەیان ( گیڤارا ) ئەو پزیشکە بوو کە شۆڕشی هەلگیرساند.
لەو کاتەی کە ( گیڤارا ) بۆ جێهێشتنی کۆنگۆ لە خۆئامادەکردن دا دەبێ ، کۆکۆبیریدۆ کە جەنگاوەرێکی بۆلیڤی بوو کێلگەیەک لە سەر کەناری روباری نانشازۆ دەکرێ ودەیکا بە بنکەی جەنگاوەران بۆ ئەوەی لە هێرشی سەر حکومەتی جەنەرال بارینتۆس ی بۆلیڤیی بەکار بێنن .
ماری مۆنگە سەرۆکی پارتی کۆمۆنیستی بۆلیڤی بوو ئەم پرسەی لەگەڵ فیدل کاسترۆ باس لێوە کرد گەیشتبونە ئەو بریارەی کە ئەم ناوچەیە بکەن بە بنکەی کاکلی شۆڕشێک کە سەرتاپای ئەمریکای لاتین بگرێتەوە ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەم ناوچەیە ماوەی سی سال دەبوو ناوچەیەکی سەربازی بوو .
لەو کاتەی ( گیڤارا ) لە پایزی 1966 بە نهێنی دەگەڕێتەوە کوبا هەندێک لە شۆڕشگێران دزە دەکەنە ناو وڵات و لە سانتا کروز ولاباز چەک وتفاق پەنهان دەکەن ، لە کۆتاییەکانی مانگی ئۆکتۆبەری هەمان سال ( گیڤارا ) بە نیازی چون بەرەو بۆلیڤیا هەنگاو دەنێ بۆ ئەوەی دەست بە شۆڕشێك بکا کە لە میانەیەوە هەموو کشوەری ئەمریکای لاتین رزگار بکا ، کاری بۆ ئەوە دەکرد ببێتە بۆلیڤار ێکی نوێ و لە رزگار کارێکی مەزن سەرکەوتو تربێ ، خەباتی تەنها بۆ لەناو بردنی ئیمپریالیزم نەبوو

بـەڵكو بـۆ یەكخستنی هـەموو وڵاتـەكانی ئـەمریكای لاتـین لـە نـاو قەوارەیـە كوتلەیـەكی سۆشیالیست دا بوو.
لەو كاتەی كە ئامادە باشیی دەكرد بۆ دوا شۆڕشی ، ( گیڤارا ) نامەیەک بۆ كوبا دەنێرێ ئەم نامەیە لە رێكخراوی هاوكاریی وڵاتەكانی هەرسێ كشوەر خوێندرایەوە لە هاڤانا لە 1967، ( گیڤارا ) وەكو جـەنگاوەرێكی خـەباتگێر كـە لـە پێنـاو گـەلانی هـەژاری دونیـا خـەباتی كـردوە بـەر لـە مردنـی لـە نامەكەیـدا بیـرو راكـانی خـۆی شـی كردۆتـەوە ، پوختـەی كـورتكراوەی فەلسـەفەی خـۆی كـە لـە ژیـانی شۆڕشـگێریدا وەدەسـتی هێنـاوە ئاماژەی پێداوە .
لە دەستپێكی نامەكەیدا ( گیڤارا ) پرسیار دەكـا ئـاخۆ لـەو بیسـت و یـەک سـاڵەی دوای جـەنگی دووەمـی جیهـانی هیچ هـەنگاوێک بـەرەو ئاشـتی نـراون یـان نـا ؟ بۆ نمونـە هـەر دوای ئەو جەنگە لە ڤێتنـام مـاوەی 30 سـال جـەنگ بـەرپا بـوە لـەم جەنگانـە گـەلی ڤێتنـام دژی سێ ئیمپریالیزم جەنگیوە كە یەک لەدوای یەک بون ، ژاپۆن دواتـر فەرەنسـا ئینجـا ئەمریكا .
ئەوەتا تا ئەمرۆش ڤێتنامیەكان لە ژێر دلۆڤانی بۆردومانی هێزەكـانی ئـەمریكی ژیـان بـە سـەر دەبەن كـە ئاشكراشـە ئـەمریكا خـۆی دەستپێشـخەری ئـەم شـەڕە بـوە ، ئـەم گلـەیی و شـەرمەزاریە ئـەو كەسـانەش دەگرێتـەوە كـە ئـەو كاتـەی كـاتی ئاشـتی دێـت لـەو نـاوچەیە دەبنـە رێگـر لـەوەی ڤێتنـام ببێتـە بەشـێک لـە دونیـای سۆشـیالیزم بـێ ئـەوەی رێگـە لـە شەرێک بگرن كە سەرتاپای دونیا دەگرێتەوە .
( گیڤارا ) لە هێرشەكانی بـەردەوام دەبـێ بـێ ئـەوەی نـاوی هەریـەک لـە چێن و روسیا بێنێ هێرش دەباتە سەر دوو هێزە مەزنەكـەی كۆمۆنیسـت كـە لـە نێـوان خۆیانـدا نـاكۆكن بـە ناكۆكیـەكانیان هێزەكـانی دژی ئیمپریـالیزم لـەت دەكـەن ، ڤیتنامیـەكان بـە هـەوڵ و توانـای خۆیـان شكسـتیان بـە كۆمـەڵگای ئـەمریكای مـەزن هێنـا ، تێیـان گەیانـدن كـە بـە جەنگ وتوندو تیژی ناتوانن دەست بەسەر دونیادا بگرن .
ئەی كەوابێ وڵاتەكانی جیهانی سێیەم لە تواناییاندا یە چی بكەن ئەگەر تارمایی شـەری جیهـانی بـوە هـۆی دابـەش بـونی دونیـا لـە نێـوان بلـۆكی سـەرمایەداری وكۆمۆنیزمیـدا ورێگەیان بە لەناو بردنی گەلی ڤێتنامی دابێ ؟
( گیڤارا ) دەڵێ : دەبێ ئەم تارماییەی جەنگ لە خۆمانی دورخەینـەوە ( بـەڵام كاتێـک ئیمپریـالیزم بـە شـەڕێكی جیهـانی دەمـان ترسـێنێ وسوكایەتیمان پێیـەوە دەكـا ، ئـەوكات كاردانەوەمان دەبێ ئـەوە بـێ كـە نەترسین ) دەبـێ وڵاتـەكانی ئـەمریكای لاتین وئاسیاو ئەفریكا بە هـەر نـرخ وبەهایـەک بـێ خۆیـان رزگـار كـەن ، شۆڕش لـە ئاسیاو ئـەفریكا دواكـەتوە بـەڵام لـە ئـەمریكای لاتـین لـەو كاتـەی شـانەكانی شـۆڕش هەڵگیرسـاندن لـە گواتیمالا وكۆلۆمبیا وڤەنزویلا و بۆلیڤیا دامەزراوە شۆڕش دەستی پێكردوە ، ئەگەر ئـەم شانانەی جەنگ هاتنە مەیدان و دەستیان بـە شـەر كـرد ئـەوا ئـەمریكا ناچـار دەبـێ خـۆی توشـی ئـەم شـەرە باكـا بـە چـەكی نـوێ و سـوپای نیزامیـەوە بەشـداری بكـات ئەوسـا

هێزەکـانی ڤێتنـام دەتـوانن بـەرۆکی هێزەکـانی ئـەمریکا بگـرن و لـە بـەرەکانی شـەردا بەسەریدا سەرکەون .
ئەمەرێگای ڤێتنامە ، ئەمە ئـەو رێگایەیـە کـە دەبـێ گـەل بیگرێتـە بـەر ، ئـەو رێگایەیـە کـە ئێمـە لـە ئـەمریکای لاتـین دەیگرینـە بـەر ، شۆڕشـی کوبـا دەبـێ کاریگـەری بەسـەر هەموو دونیاوە هەبێ دەبێ ڤێتنامێکی ترو دوان وسیانی تریش لەم دونیایە دروست بکا .
بەهۆی ئەوەی ئیمپریالیزم سیستەمێکی جیهانی یە ، ناتوانرێ شکستی پـێ بهێنـرێ تـەنها بـە بـەرەنگار بونـەوەیـەکی گشـتگیری نـەبێ ، واتـە هێـرش بـردن لەسـەر بنـەمای هـەمو دونیـا ئامـانجی بنـەرەتیی ئیمپریالیزمـە ، ڤێتنـام ئـەوەی سـەلماند کـە هێزەکـانی ئـەمریکا لەسـەر خـاکی وڵاتـی داگیرکـەر روبـەروی هێـرش وشکسـت دەبێتـەوە چونکـە جـەنگاوەرەکانی ئـەم وڵاتـە لـە پێنـاو رزگـار کردنـی وڵاتەکەیانـدا شـەڕ دەکـەن ، ئایدیۆلۆژیایـەکی بـەهێز دەتـوانێ لەشـکری وڵاتێکـی خـاوەن بـەهێزترین تـەکنۆلۆژیای پێشـکەوتو شکسـت پـێ بهێنـێ ، ورە لای سـوپای ئـەمریکای بـاکور خـالێکی لاوازی لەشـکرەکەی بـوو ئەگـەر ئـەم بـێ ورەییـە نەبوایـە ئـەوان سـەربازی بـە توانـا بـوون .
هێرشـی تونـد دەکرێتـە سـەریان دەبـێ خۆیـان لـە قوربانیـەکان بپـارێزن چونکـە هـیچ سودێکی نیە ، تەنها بە شەڕکردن دەتوانرێ شکست بە سوپای ئەمریکا بهێنـرێ و زیـان بە ئابوری یەکەی بگەیەنرێ .
ئەم شەڕە نابێ شەڕی شەقامەکان بێ کە بـە بـەرد روبـەڕوی چـەکی قـورس ببینـەوە ، یا تەنها سوکە مانگرتنێک ئەنجام بدەین ، هەروەها خەباتمان نابێ شـەڕی گـەلێکی تـوڕە بێ بـە دو تـا سێ رۆژ دارو دەستەی حکومـەتێک خـاپور بکـا ، بـەڵکو دەبـێ شـەڕێکی درێژخایـەن بـێ دەبـێ بـەرەی شـەڕ بـۆ شـارەکان بگواسـترێتەوە بـۆ گونـدەکان ومـالی جوتیارەکان بگواسترێتەوە ئەو جوتیارانەی روبەروی کوشتن ولەناو بردن بونـەتـەوە بـۆ ئەو گوندانەی بەهۆی بۆمبەکانی دوژمنەوە خاپور کراون .
بەڕاسـتی ئـەوان بـەرەو شـەڕکردن پالمـان پێـوە دەنـێن بۆیـە دەبـێ چـاک خۆمـان بـۆ سەرکەوتن ئامادە کەین.
سـەرەتاکانی شـەڕ ئامـاژە بـەوە دەدەن کـە شـەڕێکی قـورس دەبـێ ، بـەڵام تاقـە رێگـەی یارمـەتی دانـی ڤێتنـام بریتـی دەبـێ لـە بـەرپا کردنـی جـەنگێکی سەرتاسـەری دژی ئـەمریکای بـاکور . بۆیـە دەبـێ یـانکی نەلـە سینەما و نەلـە ماڵەکـەی خـۆی هەسـت بـە ئارامی وگیان پارێزراوی نەکان ، دەبێ وا هـەسـت بکـا کـە ئاژەلێکی بـێ ئومێدە ، ئـەو کاتەی رەفتـارە ئاژەلیەکانی زیـاد دەبن دەبێ ئـەوە بزانـێ کـە لـە مـردن نزیـک بۆتـەوە ، بۆیە ئەرکی هەموو لایەکە ئەمرۆ بەیەکەوە بۆ نێو نەتەوەییەکی پرۆلیتاری بجەنگین .
مردن لە ژێر ئالای ڤێتنام یا فەنزویلا یا گینیا یا بۆلیڤیا هـەمان خۆشـی وسـەرفرازیی ئـەمریکی و ئاسـیایی وئـەفریکی یـا ئـوروپیی هەیـە ، هـەر کەسێـک کاتێـک لـە پێنـاو رزگاری هەر وڵاتێکدا دەمرێ مانای ئەوەیە لە پێناو رزگار کردنی وڵاتەکەیدا دەمرێ

ئەو سەردەم بەسەر چو کە وڵاتەکانی دونیای سێیەم لەیەک دور بوون ، دەبێ هەموو وڵاتێک یەکگرن بۆئەوەی روبەروی ئیمپرایلیزمی هاوبەش ببنەوە کە ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە و لە ناوەخۆیدا دەستی بە هەڵوەرین و بۆگەن بون کردوە .
( لە هەر شوێنێک مردن پێمان دەگا بە خێر بێ ، دوای ئەوەی هاواری جەنگین مان گەیشتە گوێچکەی گوێگران ودوای ئەوەی داستانی تر هاتون تا چەک هەڵگرن و دوای ئەوەی پیاوانی تر بونەتە هاو سەفەری شارستانێتی شەهیدان بە هەلهەلەی رەشاش و هاواری جەنگی نوێ هەلهەلەی سەرکەوتن لێدەدەن ) .
ئا بەم رۆحیەتە ( گیڤارا ) دەچێتە بۆلیڤیا بۆ ئەوەی لە وێ بجەنگێ و لەوێش گیان بەخت بکا .

--------------------------

**مردن و هێرش بردن**

رۆژانەکانی ( گیڤارا ) لەو پەرتوکانەیە کە پڕترین نوسین و یادەوەریی بەسودی لە خۆ گرتوە ، بە هەستێکی مرۆڤایەتی نوسراونەتەوە . ئەم یادەوەریانەی لە ماوەی 11 مانگی خەباتی چەکداریی نوسیونەتەوە کە تیایدا ئاماژە بەو ژیانە سەختەی دەکا کە لە نێو دارستان و چیا وناوچە دابراوەکان و بەرانبەر بە سەرسەخت ترین دوژمنی بەسەر بردوە . تیایدا پێداگریی لەسەر گیانی خۆراگری کردوە ، دەرون وناخی ( گیڤارا ) ئاشکرا دەکا کە ئامادە نەبوە بۆ جەنگ ، بەڵام سەردەمی گوتار وفەلسەفە بەسەر چوە ، هیچ لەبەر دەم ئەم شۆڕشگێرە نەماوە تەنها ئەوە نەبێ هانی جەنگاوەرەکانی بدا لەگەڵ خۆیدا بەرەو بەرەکانی جەنگیان بەرێ بۆ مردن ، هەروەها یادەوەریەکانی پڕن لە نامەی هاوار وبانگەوازی بۆ یارمەتی وگەیاندنی خۆراک وچەک وتەقەمەنی ، وێرای ئەمەش باس لە داستانی هەڤالانی خەبات و ورەو تەباییان دەکا کە هەموو دەمێک پێویست بە ئاماژەپیدانیان دەکا . لە شوێنێک دەڵێ :
( جگە لە ئێمەی مەفرەزەی ناوەنجی کەسی تر نەیتوانی لە روبارەکە بپەڕێتەوە ئەمەش بە یارمەتی دکتۆر رۆبیو بوو ، مەبەستمان بوو بگەینە سەرچاوەی روباری ناشواسو بەڵام سێ لە هەڤالانمان مەلەیان نەدەزانی ئەمە جگە لە کۆلە پشتەکانمان بۆیە ماوەی یەک کیلۆمەتر رۆیشتین تا بەردە بازێک بدۆزینەوە لێیەوە بپەرینەوە ، بەم شێوەیە 11 لە هەڤالانمان بۆ رۆژی دواتر مانەوە لە چاوەروانی ئەوەی دکتۆر رۆبیو جارێکی تر لە روبارەکە بپەڕێتەوە ، توانیمان چوار باڵندە راو کەین بەڵام هەرگیز نەمان دەزانی کە تامی گۆشتەکەیان ئەوەندە ناخۆشە تا ئەو کاتەی خواردمان ، هەموو شتێک تەڕو پڕ لە ئاو بوو سەرەڕای بەردەوامی شێداری کەش و هەواکە ، ورەی جەنگاوەرەکان لە روخاندا بوو پای میجویل وتورمت ئاوسابوو هەروەها هی هەندێکی تریش ، ئێمە لە بەرزایی 580 مەتر دابوین ).

ئەمە بوو روداو یا چۆنیەتی بەسەربردنی رۆژێکی جەنگاوەرەکان ، ئەمە جگە لە مردنی کتو پڕ یا کەوتن بەسەر کەمینێکی دوژمنا کە لە مەزندە دانەبوو ، بەڵام نوسینی یادەوەریی هەستی جەنگاوەرەکان ، ئەمەش مەزندە ناکرێ کە هەموو پڕ بوو لە گێرانەوەی ئەو خۆشیانە کاتێک ئەو 30 جەنگاوەرە گەمارۆ دراوە هێرش دەبەنە سەر سەنگەرێکی دوژمن و دەستی بەسەردا دەگرن ، کاتێک لە شەڕەکانی ئەلسیرا مایسترا توما و هەڤاڵەکانی دەکوژرێن ئەوکاتە ( گیڤارا ) یادەوەریەکانی بە شێوەیەک دەنوسێ کە زیانەکان تۆمار دەکا بەهەستێکی پڕ لە ئازارەوە دەنوسێ :

( بە لەدەست دانی هەڤاڵ تۆما و هەڤاڵەکانی زیانێکی زۆرم پێکەوت ، ئەو هەڤاڵەی کە بە درێژایی ساڵەکانی رابردو بەیەکەوە بووین ، تا سەر ئێسقان دڵسۆز بوو ، لەدەست دانی تۆما بۆمن وەکو لەدەست دانی منداڵێکم وا بوو ، ئەو کاتەی دەکەوێتە خوار داوا لە هەڤاڵەکانی دەکا کە کاتژمێرەکەی خۆی بەمن بدا ئەوەتا تا ئێستا دەستم پێیەوە گرتوە ، خستمانە سەرپشت لێی دورکەوتینەوە تا بە خاکی بسپێرین .

ناخۆشیەکانی سەرکەوتن پێویستی بە هەست کردن بە قەزاو قەدەر هەیە . لە هەموو بیرەوەریەکانی کوبادا دەبینین کە مردن بەرۆکی بەرنادا لێرەو لەوێ لەگەڵیدایە ، ( گیڤارا ) بۆ ئەوە نەچوبوە بۆلیڤیا تا لەوێ بمرێ بەڵام دەیزانی کە ئەم کێشانە رێگەی پێنادەن بە زیندویی بمێنێتەوە ، لە شەڕەکانی کوبا ئەوە فێربوو کە ئاساییە لە سەرەتای شەڕەکان ئەگەری لە ناوچونی هەموو گروپەکەیدا هەبێ ، هەروەکو لە ئەلیگریادی پیۆ رویدابوو ، بۆیە دەبێ ئەم گروپە ئەو کانسەی هەبێ کە بە زیندویی بمێننەوە ، بەڵام کانسی ( گیڤارا ) لە بۆلیڤیا کۆتایی هات .

ئاسانە ئەگەر دەرسێک لەو روداوە وەرگرین کە ( گیڤارا ) دەکوژرێ و هەرەس بە یاخی بونە چەکداریەکەی بۆلیڤیا دێت ، لەبەر هەندێک هۆکار ئەوە دەبینین کە سەرکەوتن لە بۆلیڤیا دورە هەروەکو لە کوبا رویدا ئەمەش لەبەر ئەوەی:

یەکەم/ چونکە ( گیڤارا ) بۆلیڤی بوو جەنگاوەرەکانی تریش کوبی بون ، ئەوەبوو لە ئەمریکای لاتین بە بەردەوامی لەسەر هێڵی نیشتمانی ونەتەوایەتی دەرۆیشتن ، بۆیە لەیەک تێنەگەیشتن لە نێوان جەنگاوەرە کوبی وبۆلیڤیەکان رویدا ، هندیە بۆلیڤیەکان نەک تەنها گومانیان لە کوبیەکان بوو بەڵکو بە پیاوی رەشپێستی درۆزنیشیان دەزانین .

دوەم / پێشتر رژێمی حوکمی بۆلیڤاری لە سەردەمی حوکمرانیی چەپەکان بە پرۆسەی چاکسازیی کشتوکاڵی هەڵسابون ، هندیە بۆلیڤاریەکان ئەو کات تا ئاستی نەداری هەژاربون بەڵام ئێستا بۆ یەکەم جار لە 300 ساڵەوە ئێستا خاوەنی زەویی خۆیانن ، دیارە بەدەستەوە بونی یەک فەدانی زەوی لە خەونێکی مەزن باشترە ، بۆیە یەکێک لە هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی ( گیڤارا ) لەم وڵاتە ئەوەبوو کە نەیتوانی لە ماوەی یانزە مانگدا تەنها یەک جوتیار رازی بکا بۆ بەشداری پێکردنی لە شەڕی پارتی زانی .

( گیڤارا ) لە پەرتوکەکەیدا بەناوی ( شەڕی پارتیزان ) دەنوسێ کە یەکێک لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی شۆڕشێ کوبا هاوکاریی جوتیارەکان بوو لە ئەلسیرا مایسترا

( دەست پێکردنی جەنگێکی لەم جۆرە بێ هاوکاری دانیشتوانەکە ، دەروازەیەکە بۆ کارەساتێکی مسۆگەر ) .
هەندێک هۆکاری تریش هەبون بۆ سەرنەکەوتنی شۆڕش ، دابرانی جەنگاوەرەکان لە دانیشتوانی شارو دێ مەزنترین نەهامەتی بوو ، بۆیە هەرزوو لایەنگرانی چینی مامناوەندی بە هاوکاری خائینە هەڵگەراوەکانی ناو شۆڕشگێرەکان بەهۆی نەبونی سەبرو خۆراگری و هۆکاری هاتوچۆ شۆڕشێکی هەمان شێوە لە پیرۆی ئەمریکای لاتین تیادەبەن ، ( گیڤارا ) ئەوەندە توند و بە دەست و برد نەبوو بەرانبەر بە خائین وخۆفرۆشان بۆ ئەوەی حوکمی شۆڕشگێرانەیان بەسەردا بسەپێنێ و گولە بارانیان بکا تا ئەوکاتەی بنکەکەیان دەگیرێ و دەکەوێتە دەست دوژمن و خۆراک وپێداویستیەکانی تفاق و دەرمانەکانی نەخۆشیی تەنگە نەفەسیی تیا دەچن کە دوبارە پەیدا کردنەوەیان کارێکی ئەستەم دەبێ .
سێیەم / لەت بونی هێزە کەی بۆ دوو لەتی بچوک کە دواتر هەردوو لەتەکە راو دەنرێن ودواتر لە ناو دەبردرێن ، لەگەڵ لاواز بونی جەستەی ( گیڤارا ) لاوازی توانای جەنگین وتوانا فەرماندەیی سەربازیی پێوە دیاربوو . جارێکیان ئەوەندە توشی هەڵچوون دەبێ دەگاتە ئەو ئاستەی ئەسپی هەڤاڵێکی خۆی دەداتە بەر چەقۆ ، بەڵام پالەوانێتیەکەی بە خەباتیەوە بەردەوام دەبێ سەرەڕای هەست کردنی مە مسۆگەری روخانی و روخانی گروپەکەی . بەهۆی ئەوەی توانای خۆراگریی مابوو درێژەی بە شەڕکردن دا .
هاوکێشە سیاسیەکانی ناوەوەی بۆلیڤیا هۆکاری شکست هێنانی ( گیڤارا ) بون ، سەرەڕای ئەوەی جەنەرال بارینتۆس بۆلیڤی دەبێ ( گیڤارا ) دەتوانێ تاوانباری بکا بەوەی چەک وتەقەمەنیی لە ولایەتی یەکگرتوەکانی ئەمریکای وەرگرتوە ، هەروەها لە توانای بارینتۆس دابو شۆڕشگێرەکان بەوە تاوانبار بکا کە هاوردەن و لەلایەن کۆمۆنیستە کوبیەکانەوە هاوکاری دەکرێن ، پێشتر فیدل کاسترۆ رازی نابێ هاورێیەتی هەندێک لەو کەسانە بکا کە رازی نەبون بۆ گرانما بچن لە ترسی ئەوەی ناو لە شۆڕشەکەی نەنێن کە داگیرکاریی بێگانەیە . بەڵام ( گیڤارا ) ئەم زانیاری وحیکمەتەی نەبوو ، گەورەترین هۆکاری روخانی ( گیڤارا ) نەبونی نەرمی نواندنی سیاسیانە بوو ، دەبوایە ئەو تەنها لەگەڵ یەک کەسدا بگاتە لەیەک تێگەیشتن بۆ ئەوەی گروپەکەی لە و مردنە رزگاربکا لە سەر دەستی هێزێکی زەبەلاح لە چاوەروانیاندا بوو ئەویش ماریو مونگە بوو ئەم مۆنگەیە سەرۆکی پارتی کۆمۆنیستی بۆلیڤی بوو ، دەبوایە ( گیڤارا ) رەزامەندی ئەو وەرگرێ تا بتوانێ نائارامی لە نێو کرێکارانی کانزاکان دروست بکا و هانی ئاژاوەگێریان بدا ، بەراستی کاسترۆ ئەوکاتەی دەبوایە رەزامەندی لە سیاسەتمەدارە سڤیلەکان وەرگرێ بۆئەوەی پشتگیریی بکەن لەسەر راست بوو ، ( گیڤارا ) سەرزەنشتی فیدل کاسترۆی کرد لەسەر پاشگەزبونەوەی لە پەیمانەکانیدا و وتی :

( بـەم یەکلاکـەرەوە رازی نـەبوین ، بـەڵام زەرور بـوو دەبوایـە بیکـەین ، دواتـر بـۆ ئەوکات شتێکی پێشکەتوخواز بوو ، دوای ئـەوەی بـوو بـە گرفت لـە بـەردەم پێشـوەچون دا نەدەکرا بەردەوام بین لەگەڵی ، بەڵام ئامادەییمان هەبوو بۆ سەرەوگێر کردنی )
( گیڤـارا ) رازی نـەبوو بـەم شـێوەیە کـار لەگـەڵ مـونگی بکـا ، کاتێـک مـۆنگی لـە بەرانبـەر هاوکـاری کردنـی شـۆڕش داوای ئـەوەی کـرد کـە پـارتی کۆمۆنیسـتی بۆلیڤیـا سەرپەرشـتی شـۆڕش بـاک ، ( گیڤـارا ) ئـەوکات رایگەیانـد کـە هـەردەبێ خـۆی سەرپەرشتی شۆڕش بکا ، بەدیدی ( گیڤارا ) سـەرۆک دەبێ خۆی بجەنگێ ولـە چیاو دارسـتانەکاندا دابـراو بـێ بۆیـە دەبـێ سـەرۆکێکی بـروادار بـێ ، ئەمـەش لەگـەڵ شۆڕشـەکەی کوبی دەهاتـەوە ، وایـە سـەرکردەکان خۆیـان رێبەرایـەتی شـۆڕش بکـەن ، بەهەموو حالەتێک مونگە لەو پەیمانانەی بە فیدل کاستڕۆی دابوون پاشگەز بۆوە کـە تایبـەت بـون بـە پشـتگیری کردنـی حزبـی کۆمۆنیسـتی بۆلیڤـا لـە کوبـا ، ( گیڤـارا ) سەرکردەیەکی مەیدانی بوو دەبوایە بە بڕواو بەپێی بیردۆزە تایبەتیەکانی خۆی شۆڕش ببا بەرێوە بۆیە مردنی پێ لە حاشا لە خۆ کردن خۆشتر بو.
لەگـەڵ بونـی ئـەم هـەموو ناخۆشـی وتەگەرانەشدا لـە توانـای شۆڕشـی بۆلیڤیدا هـەبوو حکومەتەکەی بارینتۆس لە رێگەی درێژەدان بـە جـەنگ سـەرنگون بکـا ،ئەو بیردۆزە رەسەنەی کوبی کە دەڵێ شۆڕش خۆی خۆی دروست دەکا وبارودۆخەکان تـەواو نـابن تا ئەو کاتـەی پیـاوە ئاقلـەکان دەست بـە شۆڕش نەکەن ئەمە جەختی لەسەر کرایەوە ، دوای هێرشـە رازاوە کـە ژمارەیـەکی کـەمی جـەنگاوەران لـە تـەموزی 1967 کردیانـە سەر شارۆچکەی سۆمایپاتاو سەربازگەکەی و دەستیان بەسـەردا گـرت ، ئـەم چاڵاکیـە بوە مایەی هەژاندنی حکومەتی بارینتوس . ئەم هێرشە بو بە گاڵتەجاری گەلی بۆلیڤی و ئەم داستانە بوە هۆی ئەوەی سنوری نیوان پیرۆو ئەرجەنتین دابخرێ وبـاری نائاسـایی رابگەیەندرێ .
دوای سـەرکوت کردنـە درندانەییـە کـەی راپـەرینی کرێکـارانی کانگاکـانی بـۆلیڤی لـە حـوزەیرانی 1967 شۆڕشـی بۆلیڤیـا خـەریک بـوو ببێتـە کـاکلی شـۆڕش لـە سـەرتاپای وڵاتەکانی ئەمریکای لاتین ، ئەگـەر ئـەوکات ( گیڤـارا ) تۆزێـک دوژمنکارانـەترو تونـد تر بوایە ئەوا دەبوایە بەو ژمارەی جەنگاوەرانی کـە 21 جـەنگاوەر دەبـون هێـرش بباتـە سەر کێلگەی زەیت وهاتوچۆکان کە پەراوێزکرابون لـە پۆلیڤیـا ، ئەمـە دور نـەبوو ببێتـە مایـەی روخـانی رژێمـی بـارینتۆس کـە دوژمنـەکانی لـە چـاوەڕوانی ئـەم دەرفەتـەدابون بیقۆزنەوە بـەڵام ( گیڤارا ) لەمـەیان خەمسارد بـوو ، بۆیـە ستراتیژیەتی سوپای بـۆلیڤی بەرەو باش بون دەچو توانیان ئەوەی لەدەستیان داوە لـە چۆنایـەتی بیگێرنـەوە ، ئـەوەبوو ئەو کەمە شۆڕشگێرەی مابونەوە لە ماوەی سێ مانگی دوایی لە حالـەتی راونـان وزیـان لێکەوتنێکی بەردەوامی دابوون .
تەنانـەت کارەسـاتی یـورو رافین کـە ( گیڤـارا ) لێـی برینـدار دەبـێ ودواتـر گروپەکـەی پەرتەوازەدەبن و بە دیلی دەگیرێن ، لـە کارەسـاتی ئـەلیگریادیپیو خـەراپتر نـەبوو .تـەنها دە کەس لەم کارەساتە نەجاتیان دەبێ ، بـەڵام دواتـر سـوپای پۆلیڤی دەتوانن پێنجیـان لـێ

بەدیل بگرنەوە ، تەنها سێ لە کوبیەکان بە سەلامەتی دەگەنەوە بنکەکانی خۆیان لە کوبا و ئینتی بیریدۆش کە فەرماندەیەکی پۆلیڤی دەبێ دەگەڕێتەوە پۆلیڤیا بۆ ئەوەی درێژە بە خەباتی خۆی بدا کە تا ئێستا بەردەوامە ، ئینتی بیریدۆ لە سالی 1968 نامەیەک لە بۆلیڤیاوە دەنێرێ تیایدا دەنوسێ :
جەنگی شۆڕشگێرانی پۆلیڤیا کۆتایی نەهاتوە بەڵکو ئێستا دەستی پێکردۆتەوە ، مردنی هەڤالی خۆشەویستمان ئەرنستو چی ( گیڤارا ) کە بە هیچ شێوەیەک ناتوانین باس لە جوامێریی بکەین لەگەڵ هەڤالەکانی ، بۆ ئێمە زیان و ژانێکی مەزن بوو ، بەڵام ئەم رووداوانە دورن لەوەی بمان ترسێنن و دەست لە شۆڕش هەلگرین بەڵکو پایەو بەهای شۆڕش لەبەر چاوی ئێمە مەزن تر دەکا .
تاکە ئامانجمان رزگار کردنی هەموو ئەمریکای لاتینە کە مەزنترین کشوەرە ونیشتمانی ئێمەیە بە شێوەیەکی کاتی بۆ بیست دەوڵەت پارچە پارچە کراوە .
ئێمە دڵنیاین لەوەی خەونەکانی بۆلیڤار و( گیڤارا ) بۆ یەکگرتنی ئەمریکای لاتین لە رێگەی خەباتی چەکداریەوە دێتە دی ، ئەمەش تاکە رێگایە کە گەل شانازیی پێوە بکا ومیلەت بەرەو ئەم ئامانجە ببزوێنێ .
ئەو گرنگی وبایەخەی حکومەتی بۆلیڤیا بە گرتن وکوشتنی ( گیڤارا )ی داو دواتر بە سوتاندنی لاشەکەی و بلاوە کردنی خۆڵەمێشەکەی نیشانەی ئەوە بوو کە ترسێکی زۆری لە دڵی حکومەت دروست کردبوو بەو هۆیەشەوە ( گیڤارا ) لە ئەمریکای لاتین بوو بە داستانی یەکگرتنەوەی ئەمریکای لاتین لە رێگەی خەباتی چەکداریەوە ، ئەوان لەوە دڵنیابون کە بە مردنی ( گیڤارا ) کێشەکەی کۆتایی نایەت ، ئەوان لە توانایاندا بوو لاشەکەی بسوتێنن وبیکەن بە خۆڵەمێش بەڵام ناتوانن هەموو نمونەکانی بسوتێنن وبیان کەن بە خۆڵەمێش ، بۆمبۆ ی پاسەوانی ( گیڤارا ) کە لە بۆلیڤیاوە رای کردو گەرایەوە کوبا بەوە رازی نەبوو دان بە شکستەکانی نەنێ دەڵێ :
( بۆلیڤیا شکستی نەهێنا ئێمە شەڕەکەمان دۆراند .. بەردەوام دەبێ لە وتەکانی : کۆمەلەی شۆڕشگێرەکان وەکو باقی پیاوەکان وایە کارێکی سەختە لە کاتی لەدایک بونیاندا بەرگریان لێ بکەیت ، چونکە هێشتا منداڵە ، بەڵام ئەگەر دەرفەت بۆ منداڵەکانمان رەخساو نەجاتیان بوو ئەوا گەشە دەکەن و پێ دەگەن ، هۆکاری سەرنەکەوتنمان لە بۆلیڤیا بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە زوو ئاشکرا بوین بۆیە دەبوایە لەو قۆناغە سەرەتاییە شەڕ بکەین .).
ئامانجەکانی شۆڕشی چەکداری کە هەموو کشوەری دەگرتەوە و کاکلەکەی لە سەنتەرێکی نزیک لە هەموو کشوەر دەبێ لە لای لایەنگرانی ( گیڤارا ) نەمرد ، بە ئەنجام گەیاندنی دوا خرا تا هاتنی کاتی راپەرینەکە .
بەراستی کاریگەری ( گیڤارا ) لە کاتی مردنیدا زیاتر بوو لەوکاتەی کە لە ژیاندا مابوو ، راستە کە مردوەکان چیرۆکیان لێ ناگێردرێتەوە بەڵام ئەوان داستان دروست دەکەن . ( گیڤارا ) تەنها یەک پاڵەوان نەبو لە پاڵەوانەکانی سەردەمی ، بەڵکو لە

هـەمویان زیـرەک تـر ووشـیار تـرو رادیکالیسـت ومرۆڤپـەروەر تـر بـوو ، گیـانی بەرخۆدانی بە سەدان شۆڕش بەخشی وهەزاران راپەرین وخۆپیشاندانی وروژاند .
سـەرمایە یـەکی دەولەمەنـدی بـۆ مارکسیسـتەکان جێهێشـت . ژیـانی خـۆی بـۆ دۆزی هەژاران تەرخان کرد بێ ئەوەی داوای هیچ لەوان ولە خوا بکا .
هـۆلی خوێنـدکاران لـە سـەرتاپای دونیـا بـە دەسـتەواژەی ( ( گیڤـارا ) زینـدوە ) رازاندراونەتەوە . شە هید بونی ، گیانی فیداکاریی بە گەنجان بەخشی ، دیارە کە ( گیڤارا ) لە پێناو هەژارەکاندا مرد بەڵام لە پێناوی دوارۆژیشدا مرد .
وا رێکـەوت کـە دوای مردنـی ( گیڤـارا ) راسـتەوخۆ بزوتنـەوەی پاسـەوانی سوری ماویست لە چین دەستیان بە بزوتنەوە کرد ، لە ساڵی 1968 گەلێک خوێندکار لـە دونیا راپـەرین وشۆڕشـیان هەلگیرسـاند ( گیڤـارا )یـان کـرد بـە سـومبولی تایبـەتی خۆیـان و پاسـەوانی سوریشـیان کـردە نمونـەی شۆڕشـەکەیان . روداوەکـانی 1968 بـە شـێوەیەکی سەرسورهێنەر لـە روادوەکـانی 1848 دەچـون کاتێـک شـەپۆلێکی راپـەڕین زۆربـەی شـارەکانی ئـەوروپای سـەرمایەداریی گرتبـوەوە ، کۆتاییەکـەی بـە سـەرکەوتنی هێـزی دەسـەلاتدار هـات ، جیـاوازی لـە نێـوان شۆڕشـەکانی خوێنـدکاران لـە 1968 وشۆڕشـی چینی مامناوەندی لە 1848 تەنها ئامانجە نوێکەی بوو ، خاڵي هاو بەشە کـەش لـە نێوان ( گیڤارا )و پاسەوانی سوری چینی چەمکی شۆڕش بوو هەردوکیان بروایان وابوو کـە دەبێ شۆڕش لە گوندەکانەوە دەست پێبکا بۆئەوەی شارەکان لە گەندەلان پاک بکاتەوە .
ئەو خوێندکارانەی چینی مامناوەندی کە لە شەقامەکانی پـاریس بەشداریان لـە شۆڕشـی ئەیار کرد ، یا ئەوانەی شیکاگۆ لە میانەی کۆنگرەی دیموکراتی یا لـە بـەرلین ولەندەن وبیـونس ئـایرس وتۆکیـۆ و مەکسیکۆسـیتی ویـا لـەو بیسـت دەوڵەتـەی تـر کـە لـە دوای سـالێک بەسـەرداچونی مردنـی ( گیڤـارا ) لـە کـەش وهەوایـەکی شارسـتانی یـا نیمچـە شارستانی هـاتبن ئەوانـە ئـەو خوێندکارانـە نـەبون کـە هـاتبن بیروراهەڵـەکانیان لـە بیـرو راکـانی مـاوو ( گیڤـارا ) بناسـنەوە ، لەگـەڵ ئەوەشـدا کاتێـک مـاو ئـەو بیسـت ملیـۆن پاسەوانەی سوری گەراندەوە سەرکار لە گوندەکان ئامـاژەی بـەو خوێندکارانـە دابـوو ، هـەر وەکـو رۆژنامـەی رۆژی نـوێی چینـی ئاگـا داری بـاوکی خوێندکارێک دەکاتـەوەو پێی دەڵێ ( جـوانترین خۆشـەویستی کـە یـەکێک بـە کـوری یـا کچـی ببەخشـێ ئەوەیـە کـە هانی بدا تا لـە ریزی پێشـەوەی ئـەو خوێنکارانـە دا بـێ کـە بەرهـەم دێنن ولـە گوندەکان خۆیـان دەگـونجێنن بـۆ ئـەوەی دوبـارە خۆیـان لەسـەر دەسـتی جوتیـار و هـەژارەکان رۆشەنیر کەنەوە .
حکومەتەکان لە ساڵی 1968 سەرکەوتن وهـەموو راپەرینـەکانیان لـە ئـەمریکای لاتین سەرکوت کردن بەمەش دەسەلاتی گەورەکان بەسـەر بزوتنـەوە نـارەزایی گەنجـەکان لـە ولاتــە کۆمۆنیسـتەکان وسـەرمایەدارەکان ولــە ولاتــە تـازە پێگەیشـتوەکاندا زال بـون لێپێچانەوەی توندیشیان لەگـەڵ خوێنـدکاران لـە هەنـدێک ولاتـی وەکـو چیـک وسلۆڤاکیاو مەکسیک وفەرەنساو چین و ئـەمریکا کـردن، بەراسـتی کاردانەوەیـەکی گشـتی بـوو کـە

دژی شۆڕشگێران بەگشتی ئەنجام درا ، ئەوانەی لە مردوەکانی ( گیڤارا )وە پەیامیان بۆ هاتبوو ).
بەر لە سەرکەوتنی لە کوبا ( گیڤارا ) لە سێ وڵاتی تر شکستی هێنابوو ، لە کۆنگۆ وگواتیمالا و بۆلیڤیا ، هەروەها شکست خواردنی شۆڕشەکانی ساڵی 1968 مانای ئەوە نیە کۆتایی بە شۆڕشەکان هات .
برواهێنان بە ( گیڤارا ) تا ئاستی پەرستن بۆ ئاستی رۆشنبیریەکەی دەگەڕێتەوە ، ( گیڤارا ) خۆی لە خانەوادەیەکی بۆرجوازی و دەوڵەمەندو زاناو سپی پێست وشارستان بوە ، وەکو زۆربەی سەرکردەی خوێندکارە شۆڕشگێرە هاوچەرخەکان کە لە نەوەی چینی مامناوەندی بون ئەوانەی ئومێدیان بە پارتە کۆمۆنیستە لاسایی کەرەوەکان و سەندیکا کانی کرێکاران نەبوو کە توانای سەرکرادایەتی کردنی شۆڕش بکەن ، ئەو توندرەوە نوێیانە لەگەڵ بیروراکانی ( گیڤارا ) و ئەوانەی وەک ئەو کۆک بوون ، ئەوەی کرا و ئەوەی هەوڵی کردنی درا کارێکی ئەستەم بوو ئەنجام بدرێ ، ( گیڤارا ) لە دایک بونێکی پێویستیی مێژویی نەبوو، بەڵکو شۆڕشگێرێک بوو خۆی ئەم بژاردەی گرتە بەر بۆیە ئەوە ئومێدێک بوو بەوکەسانەی بەخشی کە وەکو ریجی دوبریە حەزیان لێ بوو کار بکەن لە پێناو هەژارو بێبەشان بێ ئەوەی خۆیان رەش پێست یا چەوساوە یا لە ئیمتیازەکان بێبەش بن ، بەم شێوەیە ( گیڤارا ) لە دروست کراوەی خانەوادەکەی نەبوو بەڵکو دەستکردی خودی خۆی بوو .
سەرەڕای ئەوەی لەم سەردەمە شۆڕشگێر لە لامان هەر بە پاڵەوان دەمێنێتەوە بەڵام لە نێو ئەم پاڵەوانانە کەسێک نیە جێی ( گیڤارا ) بگرێتەوە ، بەرز بونەوەی رێژەی لایەنگرانی لە ئەنجامی شێوەی مردنی و روالەتی ژیانی دا بوو ، ئەو ژیانەی کە پریەتی لە سومبول ونهێنی وخەبات وململانێ ، ئەو ترسنۆکیەی کە ( گیڤارا )ی پێ لەناو بردرا بوو بە مایەی پیرۆزبون وپاڵەوانێتیی کە هەمیشە لەبەر چاوان بمێنێ ، ( گیڤارا ) خۆی ئەمەی هەڵبژارد کە کوبا جێ بهێڵێ ولە پێناو بیرو بڕواکانی خۆی بەخت کا ئەمە بوە مایەی ئەوەی لە کاسترۆو ماو بەرزتر سەیر بکرێ و سەرەڕای ئەوەی بەهرەکانی لەو دوو سەرکردە کەمتر بون بەڵام بەهرەی شۆڕشگێری وای کرد ببێتە نمونەو سومبلی شۆڕش . ئەگەر ( گیڤارا ) لە کوبا بمابایە یا بە مردنێکی ئاسایی بمردبایە وەکو مردنی کامیلۆ وسیتفیجوس ئەوکات خوێندکاران وێنەی ئەویان بەرز نەدەکردەوە وەکو ئێستا دەبینین لە هەموو دونیا وێنەی بەرز دەکرێتەوە ، دواتر نمونەیان بەو نەدەهێنا و نوسین و چاپەمەنی یەکانیان لە هەمو شوێنێکی ئەم دونیایە نەدەخوێند .
پێشکەوتوخوازەکان دژی شێوازی توندو تیژی بون، خۆشەویستیان بۆ ( گیڤارا ) بێ سنور بوو هەرچەندە لەگەڵ هەندێک لە شێوازەکانی دانین بەڵام دەنگی خۆیان دەخەنە پاڵ دەنگی هەموو مارکسیستەکانی کە ریزیان بۆ ( گیڤارا ) هەیە و دەیپەرستن ئەوان لەگەڵ کاسترۆ ئەوە دەڵێنەوە ( ئەگەر لێمان دەپرسن حەزمان لە چ دوا رۆژێکە پێی بگەین، ئەوا دەڵێین با کۆتاییەکەمان وەکو ( گیڤارا ) بێ و بەس ) .

پەرستنی مرۆڤ هەر کەسێکی بێ لە رەگەزی دوبەرەکی وئاژاوەگێری بێ بەش نیە ، لە نێوان پەرستنی مەسیح و( گیڤارا ) خالی هاوبەش هەن ، ( گیڤارا ) لە پێناو هەژاراندا جەنگا وگیانی کردە قوربانی خۆی هەلی بژاردبوو کە گەنجێتیی بکاتە قوربانی بۆ ئێمە ئەو بەبێ دەنگە دەنگ وئاژاوە لە پێناو مرۆڤایەتی دا مرد . گومانی تیا نیە ( گیڤارا ) زۆر کەسی کوشتوە ، رقیشی لە دوژمن دەبوەوە گومانیش لەوە دانیە ئەو بیروبروایەی کە ( گیڤارا ) هەیبوو سەرچاوەی لە مەزهەبی سیاسیەوە گرتوە دیارە کە زۆرکەسیش هەبوون لێی بێزار بوون هەندێک جار شێوازی مامەلەکردنی دور بوە لە مرۆڤایەتی هەروەها کەسێک بوو ژیانی ئاژەلەکانی دارستانی هەبوە ، لەگەڵ بونی ئەم تایبەت مەندێتیە و کەم و کوریانە ( گیڤارا ) پایەی ئەوەندە بەرز بوەوە گەیشتە پایەی مەسیحی رزگارکار . کاتێک بە کارەکانی ( گیڤارا )دا دەچینەوە لەگەڵ بونی هەندێک کاری نابەجێ بەڵام بروا بەوە دێنین کە ( گیڤارا ) ئەو کارانەی لە پێناو مرۆڤایەتیدا کردوە . ئەوەی لە نوسینەکانی دەری بریوە بە مردنیەوە لە سنوری بیروبروا و ئایدیۆلۆژیای دەرچوە ، ئێستا وێنەکەی هەلواسراوە وەکو هەلواسینی ئەیقونە لە گوندەکانی ئەمریکای لاتینی کاسۆلیک .

سارتەر راستی دەکرد کاتێک سەبارەت بە ( گیڤارا ) ووتی :

( یەکەم پیاوی تەواوی سەردەمەکەیەتی ) تایبەتمەندێتیی ژیانەوەی هەبوو لە 39 سالدا کارێکی ئەنجام دا کە کۆمەڵێک لە پیاوەکان بە درێژایی ژیانیان نەیان توانیوە ئەوەندە ئەنجام بدەن ، جاری واهەیە مرۆڤ وا هەست دەکا ئەمە دەبێ رۆحی بەقەدەر رۆحی کۆمەلێک پشیلە بێ . هەولی دەدا لە هەموو کارەکانیدا دیارو سەرکەوتو بێ وەکو پزیشک ونوسەری بیرەوەری و چاودێری سیاسی و سەربازی وەکو جەنگاوەری پارتی زان. وەکو ئابورینـاس وپیاوی تەکتیک و بانکزان ونەخشە دارێژەر و پیاوی رێکلام وجێبەجێ کاری هەموو ئەو کارانەی کە پێی سپێردرابون تا ئەو ئاستەی کە سەختە بوترێ گوایە هەندێک ناکۆکی وئازاری ناوەخۆی هەبو . لە هەموو گوتە و کارو بریارەکانیدا سەقامگیر ویەک قسە بوو ، کارگێری بڕواپێکراو ، ئابوریی لە ئەمریکای لاتین خوێند بوو و دواتر خۆی پەرەی پێدا ، لەگەڵ پاڵەوانێکی جەنگاوەر کە لە پۆلیڤیا بریاریدا جەنگ تاکە رێگایە بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی کۆمەلایەتی وئابوریی کشوەری ئەمریکای لاتین، جیا ناکرێتەوە ، جیاوازی لە نێوان ( گیڤارا )و کەسێکی تر ئەوەیە کە ( گیڤارا ) رێگەی بە کەس نەداوە لەجیاتی ئەو بیروراکانی جێبەجێ بکا بەڵکو هەموی خۆی پیادەی کردون .

هیچ دوفاقیەک لە نێوان گوتەو کارەکانی ( گیڤارا )دا نەبون ، ئەوەی ( گیڤارا ) دەیوت خۆی جێبەجێی دەکرد ئەو وەکو زاناکانی تر نەبوو کە دەیانگوت وەمەیدانیان بۆ کەسانی تر جێ دەهێشت بۆ ئەوەی جێبەجێی کەن ، ئەو مەبەستی بوو خۆی ئەنجامەکانی گوتەو بیروراکانی ببینێ . کەسی خەون بین هەولی ئەوە دەدا بەهرەکانی بکا بە پراکتیک بۆ ئەوەی خەونەکانی بەرجەستە بکا ، ( گیڤارا ) بڕوای بە حوکمی رەها هەبوو مەبەستی بوو هەموو شتێ بە کۆتاییەکی دادپەروەری بگا ، توند کردنی

کارەکان بە شێوەیەک وا هەست دەکرا کە ئەم کارە بێ ماندوو بون ئەنجام دراوە ، بۆ گەیشتن بە مەرامەکان هیچ کاتێک پەنای بۆ نانەوەی دوبەرەکی نە دەبرد ، کاتێک ووتی کار کردن لە پێناو برادەردا کارێکی زۆر بە هەوەست وبە تامە ، سەبارەت بە خۆی راستی دەوت ، یەکێکی تر لە گوتەکانی ( شۆڕشگێری راستەقینە ئەو کەسەیە کە لە ژێر ئالای نەتەوەیەک دا بمرێ کە هێشتا لە دایک نەبوە . ئەمەش بوو کە خۆی بەجێی گەیاند ، ئەم بەرنامەیەی جێبەجێ کرد ، وەکو ئەوەی کارێکی ئاسایی بەجێ بگەیەنێ دەیوت : هیچ مرۆڤێک نیە ئەگەر هەر چەندی پایەی بەرز بێ دەکرێ پشتگوێ بخرێ ئەمەش ئەوە بوو کە هەستی دەکرد لە خۆی دەکا ، خۆی روبەروی خەتەرناکی کردەوەو وەکو پیاوێکی تەواو و تەواوکار مرد .

بەڵکو مێژو ( گیڤارا ) بە گاریبالدیی سەردەمی خۆی دەناسێنێ کە یەکەم کەس بوە خەڵک پێیەوە سەرسام بون و خۆشیان ویستوە ، بەڵام بیروراکانی بەڵکو وا نەبن هەندێک جار بە هەمان ئاست کاریگەریان لەسەر سۆشیالیزم وشەڕی پارتیزان نەبێ ، دەبێ کاریگەریی لە ئەمریکای لاتین بەردەوام بێ لەبەر ئەوەی کەسێکی وەک ئەو نەهاتوە ، لە سەردەمی بۆلیڤارەوە ئەو تاکەکەس بووە کە نمونەی یەکگرتنی ئەم کشوەرە هەژارە بوە ، دەکرێ لە نەوەی داهاتوو پیاوی دیارو کەسایەتیی ئازا هەڵکەون بەڵام پێناچێ وەکو ئەو کاریگەریان هەبێ ، ئەوەتا رەنگدانەوەی بیروراکانی وکاردانەوەی ئەنجامی کارەکانی دوای مردنی وەدەر دەکەون کە ئەو گۆرانە کۆمەلایەتیانەن لەدەورو بەرمان روو دەدەن . کاتێک جەنەرال لە شاری ( فیفا سباتا ) سەیری لاشە شێوێنراوەکەی فەرماندەی شۆڕش دەکا ودەڵێ :

( هەندێک جار مردو دەتوانێ ببێتە دوژمنێکی ترسناک ) ( گیڤارا )ی مردو ترسێنەری گەلانی دەولەمەندی سەر زەوی و حکومەتە گەندەلە کانە کە حوکمرانی کۆمەلێک گەلی هەژار دەکەن ، بەراستی دوژمنێکی زۆر جوانە .

**<u>وەرگێر لەچەند دێرێکدا</u>**




www.serben.com

khalidherki@chello.nl


خالید عومەر میکائیل ناسراو بە ( خالید هەرکی)

- لە پایزی 1955 لە هاوینە هەواری سەلاحەدین ( سەربەن ، پیرمام ) لە دایک بوە .
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە وێ تەواو کردوە و بۆ خوێندنی ئامادەیی چۆتە هەولێر وکشتوکالی هەولێری لە خەبات لە 974 – 975 تەواو کردوە ، دواتر لە تەمەنێکی مەزندا بکالۆریۆس لە زانستە سیاسیەکان وەدەست دێنێ.
- لە 1974 بەشداریی لە شۆرش کردوە .
- لە مایسی 1977 ئەوکاتەی فەرمانبەری بانکی کشتوکالی شەقلاوە بوە بەهۆی ئاشکرا بونی رێکخستنە کانیان دەگیرێ وبە 10 سال زیندانی دەکرێ ماوەی کەمتر لە 3 سال لە زیندانی ئەبو غرێب دەمێنێتەوە دواتر بەر لێبوردنە گشتیەکەی 979 دەکەوێ .
- دوای ئازاد بونی بۆ چەند ساڵێک رو لە شاخ دەکا ودەبێتە پ.م .
- لە 996 رو لە دەرەوەی ولات دەکا لە هۆلەندا و کوردستان دەژیێ
- باری کۆمەڵایەتیی ، خێزاندارەو خاوەنی 2 کچ و3 کورە .
- یەکەم نوسینی لە 973 بوە لە رۆژنامەی برایەتی و تائێستا دەنوسێ بە چەندین نوسین و وتارلە بواری رەخنەو توێژینەوەی سیاسی بەشداریی لە رۆژنامەگەریی کوردی کردوە لە مالپەرو رۆژنامە و گۆڤارەکاندا .
- لەبواری چاپکردن دا خاوەنی 6 پەرتوکی وەرگێرانە 1/ مێژوی هاوچەرخ ، ئەوروپا لە شۆرشی فەرەنسیەوە تا جەنگی دووەمی جیهانی 2/ بیرەوەریەکانی دیگۆل . 3/ ترۆتسکی . 4/ کوردو ئەرمەن ، پەیوەندیە مێژوییەکان
- 5/ کوردستان و کوردەکان.
- 6/ گیـڤـــــــــــــــــــارا